زنجیرەی ڕۆژی دوایی (2)

# دۆزەخ

## لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوادا


ئامادەکردن و کۆکرنەوەی

باوکی محمد



پێشکەش :

بەو گەنجانەی تەمەنی لاوێتیان بەخت دەکەن لە پێناوی دینی خوادا.

بەو موسوڵمانانەی هەوڵی ڕزگار بوون دەدەن لە ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ.

بە هەموو ئەوانەی یارمەتی دەرم بوون.

---


- ناوی کتێب : گەشتێک بەناو دۆزەخدا
- ئامادە کردن و کۆکردنەوەی : باوکی محمد

چاپی یەکەم -سلێمانی -ساڵی :١٩٩٩

- لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاراک
- تیراژ ٤٠٠ دانە

## پێشەکی چاپی دووەم

إن الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور أنفسنا و من سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له و من يضلل فلا هادي له و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له و أشهد أن محمدا عبده و رسوله صلوات الله عليه و على آله و أصحابه و ذريته و من تبعه بإحسان إلى يوم الدين

**يا ايها الذين آمنوا إتقوا الله حق تقاته و لا تموتن إلا و أنتم مسلمون** (آل عمران/١٠٢)

**يا أيها الناس إتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة و خلق منها زوجها و بث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به و الأرحام إن الله كان عليكم رقيبا** (النساء/١)

**يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله و قولوا قولا سديدا ، يصلح لكم أعمالكم و يغفر لكم ذنوبكم و من يطع الله و رسوله فقد فاز فوزا عظيما** (الأحزاب/٧٠)

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله و خير الهدي هدي محمد (صلى الله عليه و سلم) و شر الأمور محدثاتها و كل محدثة بدعة و كل بدعة ضلالة و كل ضلالة في النار .

پێداچوونەوەی نامیلکەی (گەشتێک بە دۆزەخ دا) و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی بەشێوەیەکی زانستی و چڕ و پڕ کردنی بەبەڵگەی قورئان و فەرموودە و وتەی زانایان ، بەئەرکێکی سەرشانم زانی .

لەم نامیلکەیەدا زۆرینەی سەرباسەکانی گرتۆتەخۆ کە لە بارەی دۆزەخەوە هاتوون لەهەموو ئەو سەرچاوە و تەفسیرانەی بەرچنگم کەوتوون . ئەمەش هەنگاوی دووەمە بۆ بەپێزکردنی نامیلکەکانی زنجیرەی ڕۆژی دوایی

خوازیارم لەم سەرلەنوێ کۆکردنەوەو ئامادەکردنەدا سەرجەم بابەتەکانی دۆزەخم هێنابێت ، ئەمەش ببێتە زیاتر گەڕانەوە بۆلای خوای گەورەو پابەندبوون بەقورئان و فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) ، چونکە تەنها هەڵکێشرانێک لەناو ئاگری دۆزەخدا هەموو چێژو خۆشی و بەشوورییەک لەبیر دەباتەوە ؛

...الى آخر الحديث ) [1] . واتە: (لەرۆژی دوایـیدا دۆزەخی یـەک دێـنن کەخۆشترین ژیانی هەبووبێت لەدنیادا ، یەکجار لەئاگری دۆزەخ هەڵئەکێشرێت ، ئنجا پێی ئەوترێت ئەی بەنی ئادەم ، ئایا قەت هیچ خۆشی یەکت دیوە؟ ئایا قەت تووشی ئازو نیعمەت بوویت؟ ئەویش دەڵێ نەخێر خوا ئەی پەروەردگار...تاکۆتایی فەرمودەکە )

هەوڵ دراوە زانیاریەکی زیاتر و چڕ و پڕ تر پێشکەش بکرێت -بەپشتیوانی خودا-، ئەمەش لەکاتێکدا دێ لاوازی باوەڕ باڵی کێشاوە بەسەر هەندێ لەنەوەکانی ئەم نومەتەدا، خەریکە بەجارێک دڵەکان هەموو رەش دەبێت و گوناهو تاوان بڕوا دادەپۆشێت لێرە و لەوێ دارمان و بێ هیوایی لە هەندێ دەم وچاو دەخوێنرێتەوە . ئەمەش بەهۆی بێئاگایی تێگەیشتنی راست و دروست لە دوو سەرچاوە پیرۆزە کەوەیە -پێشتر وەک تەنها هاندەرێ بۆ کاری چاکە و گەڕانەوە لە خراپە. ئەم نامیلکەیە نوسرا ، بەڵام ئێستا زیاد لەمەش بەرنامە و پرۆگرامێکی زانستانە دەگرێتە بەر -بەپشتیوانی خودا- هەروەها کەشێکی ئیمانی زۆر بەهێز دروست دەکات لەدڵی خوێنەردا .

## دەسپێک

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهديه الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له واشهد ان لااله الاالله وحده لاشريك له واشهد ان محمدا عبده ورسوله (ﷺ)

بەپشتیوانی خوای گەورە لەژێر سێبەری ئەم ئیسلامە شیرینەداو لەسەر رێگای کاروانی خواویستان بابەتێکمان بۆگەڵاڵە کردوون کە هەڵێنجراوی سەرچاوەی رەوانی قورئان و فەرموودەی شیرینی پێغەمبەری سەروەرە (ﷺ) ، وەهەوڵیش دراوە زانیاری پوختی لەبارەیەوە کۆبکرێتەوە کەبریتی یە لە (گەشتێک بەناو دۆزەخ دا) بەو هیوایەی ببێتە هۆی وەبیرهێنانەوەو ئاگادارکردنەوەی گشت لایەک و جڵەوگیرمان بکات لەتاوان و سەرپێچی خوای گەورە ،

---

(١) (رواه مسلم)

وەببیتە مایەی نزیک بوونەوەی بەندەکان لەخوای پەروەردگارو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا و گەیشتن بەبەهەشتی بەرین ، بەڵێ ، خوێنەرانی خواناس ، دوای ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی لە هەموو گیاندارو مرۆڤەکان دائەماڵرێن و هیچ کەس نامێنێتەوە تەنها خودی خوای باڵادەست نەبێت

ئەو کاتەی دوا قۆناغی ژیانی دنیا کۆتایی پێدێت و سەرەتای بینینەوەی بەری ڕەنج و کۆشش دەست پێدەکات و قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی دێتە پێشەوە . ئەو ڕۆژە دوایی یەی کەلەگەڵ سەرەتای دەست پێکردنیدا بەترکەو ناڵەیەکی گەورە و تۆقێنەر دەست پێدەکات . جا بەو دەنگە ڕاچڵەکێنەرە هەموو کەس کەڕو کاس دەبێت و خەڵکی زۆر بەلاوازی و بێدەسەلاتی و داماوی و کەساسی بەتۆزو خۆڵی چەندەها ساڵەی ناوگۆڕی تاریکەوە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوەی خوایی دەڕۆن .

*باوەڕدارانی خۆشەویست* با لە دنیای بیرو ئەندیشەدا خۆمان بخەینە ئەو ساتەوە کە گرمەو ناڵەکەدێت ... واخەریکین بەرەو مەحشەر دەڕوین و لەترساندا دڵمان دەلەرزێت و ڕەنگمان هەڵپرسکاوەو سەرمان سپی بووە چاومان بڕیوەتە ئەو شوێنەی کەوا دەنگەکەی لێوەدێت ، بەڕووت و قووتی بەترس و بیمەوە لەناو جەنجاڵی ئاپۆرەی ئەو خەڵکەداین ، وەهەر لەو ساتەدایە کەخوای گەورە هێزو دەسەلاتی لەهەموو کەس سەندووەتەوە ، ئەوەتا شەیتانەکانیش کە تا دوێنێ لەسەر زەویدا سەرکەش و یاخی بوون ، وانەمڕۆ ئەوانیش زەلیل و بێدەسەلات و زەبوونن ، تەنانەت هەموو دڕندەو گیاندارەکانیش لەو ڕۆژەدا کش و مات و بێتوانان .

ئەی دوایی حاڵی ئاسمانەکان و ئەستێرەکان چۆن دەبێت ؟

بەلام حاڵی ئەوان گەلێ خراپترەئەوەتا ئەستێرەکان بەو گەورەیی وزەبەللاحی یەیانەوە دەکەونە خوارەوە و خۆر و مانگ لەناو دەچن و ڕوناکی یان نامێنێت و لەپەخش و ڕوناکی دەکەون و زەوی بەجارێ پارەپارە دەبێت و فریشتەکان پۆل پۆل دێنەخوارەوە ئنجا لەو وێستگەیەدا بۆماوەی (٥٠٠٠٠)ساڵ[٢] ڕادەوەستین وخۆر هێندەنزیک دەبێت بەدووری(٣)میل خەلکی بەپێی گوناهەکانی خۆیان لەئارەق و جوانای خۆیان غەرق دەبن لەو ڕۆژەدا هەر کەس دەڵێت ( نفسي ، نفسي )[٣]

---

(٢) لە ریوایەتی موسلیم و بوخاری دا هاتووە . هەروەها لە (الترغيب والترهيب) دایە کە بۆماوەی (٤٠) یان (٥٠) (١) (رواه مسلم) یان (٨٠) هەزار ساڵە

(٣) ئەم باسە لە کتێبی (إبن كثير) و (قصص الأنبياء) و (الترغيب والترهيب) دا هاتووە

واتـە (هـەرخۆم هـەرخۆم) ڕزگارم بیت هێنده ساتەوەختەکە ناهەموارە خـەڵکی تێکرا داوادەکەن کەکێ دەتوانێت مۆڵەت لەخوا بخوازێت وەداوای لێبکات کەئیتر دادگایی خۆی دەست پێبکات و چاک و خراپە جیابکاتەوە . باشە ، واچاوەڕوانی کۆتایی پێدێت و خـوای گـەورە دێتە خوارەوە بۆ لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە ،

جاهەر کەس بەپێی ڕەفتـارو کردەوەی خـۆی مـافی وەردەگرێـت ، وتاوانبـاران و بێباوەڕان بەنێوچاوان ڕادەکێشرێن لەسـەر سـەر بـەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێـن ، بـەڵام چ دۆزەخێک ؟ ئـەو دۆزەخـەی سکاڵا لای خـوا دەکـات و دەڵێـت : (ئـەی خوایـە گیـان بەشێکم بەشـێکمی خـواردو سووتانی ) (٤)

ئەودۆزەخەی کەهەموو لاشەی مرۆڤ دەخوات ودەیسوتێنێت جگە لەشـوێنی سـوجدە نـەبێت ، کەئـەویش خـوای گـەورە بـە بـەزەیی خـۆی حـەرامی کـردووە لەسـەر ئـاگر کەبیسـوتێنێت: وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت :**( تـأكل النار ابن آدم الا اثر السجود حرم الله على النار ان تـأكل اثر السجود )** (٥)

واتە : ( ئاگر هەموو لاشەی ئادەمیزاد دەخوات جگەلە شوێنی سـوجدە نـەبێ ، خـودا حـەرامی کردووە لەسەر ئاگر کە بیسوتێنێت )

ئـەی ئـەوەی ئـادەمی هەڵخەڵـەتاو هەتاکـەی نەفسـت ئاگرێتـەوە و فریـوت دەدات و شـەیتان لەخشتەت دەبات بێدار بەرەوە و شەرم بکە لە خوا وازبهێنە لە تاوان . ئەی نەفسیپیسی تاوانکار خەجاڵەت بـیت دەتـەوێ خەجاڵـەتی قیامـەتمان بکـەی ، پەشـیمان ببـەرەوە ، لەخـەوی غەفڵـەت ڕاپەڕەو پێش ئەوەی ڕوو ڕەشی بەر قاپی خودابیت . خۆت بپارێزە لـە تاوانـەکان ، پێش ئـەوەی هەموو ئەندامەکانت ببنە شایەت لەسەرت و بەجارێ هەموو کارە ناپەسەندەکانت پـەردەی لەسـەر هەڵ بماڵرێت . ئەی نەفسە نەفامەکە هەتا کەی دۆزەخ نات ترسێنێت و دیمەنـەکانی ناتگێڕێتـەوە لەتاوان . لەبیری خۆتی دەبەیتەوە کە گوناهکارێکی دۆزەخیی لەبنی دۆزەخدایە کەیەکپارچە بۆتە قەقنـەس - خـەڵوز -و نکـەنک وهـاوار دەکـات تامـەزار سـاڵ و دەڵێـت: **( یاحنـان ، یاحنـان ، یامنان... )** (٦)

---

(٤) رواه البخاري

(٥) صحيح سنن إبن ماجة (ص ٤٣٥ ج٢)

(٦) (بڕوانە تەفسیری – ابن كثير – ) .

دەنەوێ ببیتە سووتەمەنی دۆزەخ بەسزای لاشەیی و دەروونی پڕ ئێش دا ببڕێیت ، هەتاکەی بۆ ساتێکیش بیت بیرو هزر لەحاڵی خۆت ناکەیتەوە و لەم دێڕە شیعرە پەند وەرناگریت:-

**ڕێبوارێکم بۆ تویشوویەک لام داوەتە ئەم دونیایە**

**کۆچ کردنی یەکجارەکیم لە ئەمڕۆ یا سبەیدایە**

دەبا ئەی نەفسەکە پەندو دەرس وەربگریت و ، هاواری ئەندامەکانی لاشە لەتاوت بەرز نەبێتەوە...

وەک شاعیر دەڵێت:-

تكاسلت نفسي لسعي سعادتي

ماانتهضت شوقا للعبادة

وائێمەش بەپشتیوانی خوای گەورە چەند زانیاریەک دەربارەی دۆزەخ و دیمەنەکانی ، بەپێی قورئان و فەرمودە ڕاستەکان دەیخەینە بەر دیدەی خوێنەری بەڕێز بەهیوای ئەوەی سوودمەند بێت بۆتان و مایەی ڕەزامەندی خوای میهرەبانیش بێت .

## ئایا ئێستا دۆزەخ دروست کراوە

بەڵێ زۆربەی هەرە زۆری زانا پێشینەکان لەسەر ئەو ڕایەن کەئێستا دۆزەخ دروست کراوەو هەرگیز لەناوناچێت ، وەخوای گەورە پێش دروست کردنی ئادەمیزاد و جنۆکە دۆزەخی دروست کردووە

لەڕاستیدا چەندەها ئایەتی پیرۆزیش ئاماژەیان بۆ ئەم ڕاستیە کردووە ، لەفەرموودەیەکی بەنرخیشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **(وَ الذي نفسي بيده لو رأيتم ما رأيت لضحكتم قليلا و لبكيتم كثيرا ، قالوا ما رأيت يارسول الله ؟ قال : رأيت الجنة والنار)** [٧] . واتە: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئەوەی من بینیومە ئێوەش بتان بینیایە ئەوا ،کەم پێدەکەنین وزۆردەگریان ،فەرموویان چیت بینیوە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی (بەهەشت ودۆزەخم بینیوە ) .

(٧) رواه مسلم

کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێستا دۆزەخ دروست کراوە ، لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە: پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: **( أن احدکم اذا مات عرض علیه مقعده بالغداة والعشي ، ان كان من اهل الجنة فمن اهل الجنة ، وان كان من اهل النار فمن اهل النار... )** [٨] واتە (هەریەک لەئێوە کەدەمرێت ، لەگۆڕا جێی خۆی نیشان دەدرێت ، گەر لەبەهەشتی بێ ئەوە لەئەهلی بەهەشتە ، وەئەگەر دۆزەخی بێت ئەوا لەئەهلی دۆزەخە...)

لە (صحيح مسلم) دا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خوای لێبێت) فەرموویەتی : **( رأيت في مقامي كل شيء وعدتم به ، حتى لقد رأيتني آخذ قطفا من الجنة حين رأيتموني تقدمت ، ولقد رأيت النار يحطم بعضها بعضا حين رأيتموني تأخرت )**

واتە : (لەم جێیەدا هەموو ئەو شتانەی پەیمانتان پێدراوە بینیم ، هەتا هێشووی تریی بەهەشتم دەگرت ، کەمنتان بینی بەرەو پێش ڕۆیشتم ، وەبەڕاستی ئاگرم بینی بەشێکی بەشێکی تری تێک دەشکاند ، کاتێ کەمنتان بینی بۆ دواوە دەگاڕامەوە) . بەڵگەی تر لەسەر دروست کراوی بەهەشت ، پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: **( لما خلق الله الجنة ، قال لجبريل : اذهب فانظر اليها...الحديث )** [٩]

واتە : (کاتێ خودا بەهەشتی دروست کرد ، فەرمووی : (ئەی جوبرەئیل برۆ سەیری ناو بەهەشت بکە...فەرموودەکە) .

بەڵام لەبارەی شوێنەکەیەوە زاناکان چەند بۆچونێکی جیاوازیان هەیە .هەندێکیان دەڵێن: لەبەشی خوارەوەی زەوی دایە هەندێکی تریشیان دەڵێن دۆزەخ لەئاسماندایە ، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە کەهیچ بەڵگەیەک ڕاستەو خۆ نەهاتووە لەسەر دیاری کردنی شوێنەکەی [١٠] . کاتێ کۆبوونەوەو لێپرسینەوەی خوانەناسان کۆتایی هات ویستیان بەسەر پردی (صراط) دا -کەبەسەر دۆزەخ دا دەڕوات- بپەڕنەوە وەک باوەڕداران ، ئەوا فریشتەکان وازیان لێناهێنن بەئاسانی بپەڕنەوە بەڵکو قولاپیان لێگیردەکەن و ڕایاندەکێشن بۆ دۆزەخ ، ئەو دۆزەخەی کەجێی سەرشۆڕی و سزاو ڕیسوایی یە ، کەهەموو جۆرە سزایەکی تێدایە ، وەئەوانەی کەلەناو دۆزەخدان دەبێت کێم و خوێن و زووخاوی پاشماوەی سوتێنراوانی تر بخۆن ،

---

(٨) متفق عليه

(٩) (رواه البخاري واحمد وابوداود)

(١٠) الجنة والنار (د. عمر سليمان الأشقر)

سوێند بەخوا دۆزەخ شەڕێکی کوشندەیە کەلاشە بێهێزەکەت لەبەرامبەر کەمترین سزایدا ڕاناگرێت ئاگاداربە ، وریابە ، هەوڵ و کۆشش بکە بۆ خۆت ڕزگار ناکەیت ؟! ئـەوەتا میکـائیل کـە فریشـەتە یەکە لە لایەن خوای گەورەوە لە تاوان پارێزراوە، لەو ڕۆژەی دۆزەخ دروست کراوە پێ ناکەنێت

عن إبـن عبـاس ( ڕەزای خـوای لێ بێـت) **عـن رسـول الله ( ﷺ ) : ( قـال لجـبريل : مـا لي لا أرى ميكائيل ضاحكا قط؟! قـال : ما ضحك ميكائيل منذ خلقت النار )** [١١]

واتە : ( پێغەمبەر ( ﷺ ) بـەجوبرەئیلی فـەرموو: بۆچی هـەرگیز میکـائیل نـابینم پێبکـەنێت ؟ ئەویش فەرمووی : ( میکائیل لەڕۆژەی دروست بوونی ئاگرەوە پێنەکەنیوە )

## یەکەم: ڕەنگی ئاگرەکەی

ئاشکرایە کەئاگر تەنێکی گەرمی کڵپە سەندووی درەوشاوەیە لەدنیادا ، بەڵام ئاگری دۆزەخ لای ئێمە زانراو نییە ، ناشتوانین هیچ لەبارەیەوە بزانین مەگەر زانیارییـەک لەڕێگـەی پـەیامی خـواوە پێمان گەیشتبێت . ئیمامی ( بوخاری ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) لەبارەی زۆر ڕەشی ئاگری دۆزەخـەوە فەرمودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت : **( اترونها -نار جهنم- حمـراء كنـاركم هـذا ؟ لهي اشد من القار)** [١٢] .واتە : (ئێوە دەزانن ئاگری دۆزەخ وەکو ئـاگری ئێـوە سـوورە ؟ بـەڵکو لەقیر ڕەشترە ) .

لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە : **( اوقد على النار الف سنة حتـى احمرت ، ثـم اوقـد عليهـا الف سنة حتى ابيضت ، ثم اوقد عليها الف سنة حتى اسودت مظلمة )** [١٣]

واتە : (ئاگری دۆزەخ گڕوتینی پێدرا بۆماوەی هەزار ساڵ هـەتا سوور بـوو، پاشـان گڕوتینـی پێدرا هەتا سوور بوو ، پاشان گڕوتینی پێدرا هەتا سپیبوو ، پاشـان گڕوتینـی پـێدرا بۆمـاوەی هەزار ساڵ هەتا ڕەش داگیرسا ) .... هەندێ لەزانایانیش کاتێ لەبارەی بونەوەرەوە دەدوێن باسی ئەم جۆرە ئاگرەدەکەن ، کەبەهۆی تێڕوانینیان بۆ خۆرو ئەستێرەکانی ترەوە بەدییان کردووە

(١١) رواه أحمد من رواية إسماعيل بن عياش وبقية رواته ثقات تهذيب الترغيب والترهيب .

(١٢) عقيدة المؤمن (أبو بكر جابر الجزائري)

(١٣) ئەم فەرمودەیە لاوازە بگەڕێرەوە بۆ (الترغيب والترهيب) ی مامۆستای فەرموودەناس (محمد ناصر الدين الألبـــاني) خوای گەورە ڕێنموی ئەوانە بکات کە بەبێ زانست هێرش دەبەنە سەری لێرەو لەوێ

## دووەم: قووڵایی دۆزەخ و تینی گەرمیو فراوانییەکەی

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت **(ان الصخرة العظيمة لتلقى من شفير جهنم فتهوى فيها سبعين عاما ما تقضي الى قرارها )** [١٤] واتە بەردێکی گەورە فڕێ دەدرێتە ئاگری دۆزەخەوە ، حەفتا ساڵ بەردەبێتەوەو هێشتا ناگاتە جێ -واتە بنکی دۆزەخ-

هەروەها (ابو هريرة) (ڕەزای خوای لێ بێت ) دەفەرمووێ: (ڕۆژێکیان لای پێغەمبەر (ﷺ) بووین، گوێمان لەدەنگێکی زۆر بەرزبوو ئنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەوە زانیتان ئەو دەنگە بەرزە چیبوو ؟ وتمان خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانن فەرمووی: (ئەوە یەکێ بوو لەبەردە گەورەکان کەخوای گەورە فڕێی دایە ئاگری دۆزەخەوە ، (٧٠) ساڵە بەرێوەیە ، ئێستا گەیشتە جێگای خۆی) .

لەفەرمودەیەکی ڕاستدا هاتووە: **(لو كان المسجد مائة الف او يزيدون وفيهم رجل من اهل النار فتنفس فاصابهم نفسه لاحترق المسجد ومن فيه )** [١٥] . واتە : ئەگەر لەم مزگەوتەدا هەزار یان زیاتر هەزار کەسی تیابێت و یەکێکی ئەهلی دۆزەخی تیابێت ، هەناسە بدات و هەناسەکەی بەریان بکەوێت ، ئەوا هەناسەکەی مزگەوت و ئەوەشی تیایەتی دەیسوتێنێت یان (ئەوەی تیایەتی دەیستووتێنێت) .

لەکتێبی پێشەوا (احمد ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە (الزهد) (٢-٣١) هاتووە : جارێکیان ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ ) داوای ئامۆژگاری لەکەعب کرد و فەرمووی :

**(ياكعب خوفنا ، قلت ياامير المؤمنين اوليس فيكم كتاب الله وحكمة رسول الله (ﷺ) ؟ قال :بلى ولكن خوفنا ، فقلت ياامير المؤمنين اعمل عمل رجل لو وافيت يوم القيامة بعمل سبعين نبيا لازدريت عملك مما ترى ، فاطرق عمر - ونكس - مليا ثم افاق فقال : زدنا ياكعب . قلت : ياامير المؤمنين لوفتح من جهنم قدر منخر ثور بالمشرق و رجل بالمغرب لغلى دماغه حتى يسيل من حرها ، فاطرق عمر -ونكس- مليا ثم افاق ، فقال : زدنا ياكعب . قلت : ياامير المؤمنين آن جهنم لتزفر يوم القيامة زفرة لايبقى ملك مقرب او نبي مصطفى الا خر جاثيا على ركبتيه ويقول رب نفسي نفسي لااسئلك اليوم الا نفسي ، فاطرق عمر مليا . فقلت :**

---

(١٤) رواه أحمد والترمذي وصححه الشيخ الألباني

(١٥) رواه ابن يعلى واسناده حسن وفي متنه نكارة (تهذيب الترغيب والترهيب)

**یاامیر المؤمنین ، اولیس تجدون هذا في کتاب الله عزوجل ؟ قال : کیف ؟ قلت : قول الله تبارك وتعالی : (یوم تأتي کل نفس تجادل عن نفسها وتوفی کل نفس ماعملت وهم لایظلمون ) ( النحل )** (١٦)

واتە : (ئەی کەعب بمان ترسێنە ووتم ئەی ئەمیری موسوڵمانان ئایا لەنێو ئێوەدا کتێبەکەی خواو سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) نییە ؟ فەرمووی : (بەڵێ هەیە !بەلام بمان ترسێنە ، پاشان ووتم ئەی ئەمیری موسوڵمانان تۆ ئەوەندە کاری گەورەو زۆر بکە ئەگەر لەڕۆژی قیامەتدا بهێنرێیت هەتا ئەندازەی حەفتا پێغەمبەرکاری چاکەت کردبێت ، هێشتا کارەکەت بەکەم دەزانیت لەچاو ئەو نارەحەتیانەی کەلەقیامەتدا دەیبینیت . ئیمامی عومەر سەری دانەواندو ماوەیەک دۆش داما ، پاشان بەئاگا هاتەوە ، پاشان فەرمووی : زیاتر بمانترسێنە ئەی کەعب ووتم : ئەی ئەمیری موسوڵمانان گەر ئەندازەی لوتی گایەک لەڕۆژهەڵاتەوە دۆزەخ بکرێتەوە وەپیاوێکیش لەڕۆژئاوابێت ، ئەوا ئەو پیاوە مێشکی دەکوڵێت و هەتا لەگەرمیدا دەتوێتەوەو دەڕوات . پێشەوا عومەر سەری دانەواندو ساتێک بێئاگابوو ، پاشان هاتەوە هۆش خۆی ، ئنجا فەرمووی : ئەی کەعب زیاتر بمان ترسێنە . ووتم : ئەی ئەمیری موسوڵمانان بەڕاستی لەقیامەتدا دۆزەخ دەنگ و هاوار و ناڵەیەکی گەورەی وەهای لێ دێت ، کەهەرچی فریشتەی نزیک یان پێغەمبەری پاڵێوراو هەیە لەسەر ئەژنۆ دەکەون و دەڵێن : ئەی پەروەردگار تەنها نەفسی خۆم داوادەکەم تەنها نەفسی خۆم وەداوای کەسی‌ترت لێناکەم تەنها نەفسی خۆم ڕزگار بکە ، ئیمامی عومەر سەری دانەواندو کەمێک بێئاگابوو . ئنجا من ووتم : ئەی ئەمیری موسوڵمانان ئایا ئەم ڕوداوە لەکتێبەکەی خوای گەورەو میهرەباندا بەدی ناکەن ؟ فەرمووی چۆن ؟ وتم : ئەم ووتەی خوای گەورەیەکەلەواتایدا دەفەرموێت:-

(قیامەت ئەو ڕۆژە سەختەیە کەهەموو نەفسێک تەنها بەرگری لەنەفسی خۆی دەکات -چونکە بەندەکان هەتا پێویستیان بەئەندازەی گەردیلەیەک خێر هەیە لەو ڕۆژە نارەحەتەدا - وەهەموو نەفسێک خێر یان خراپەی کردبێت نیشانی ئەدرێت وەستەمیان لێناکرێت- واتە نەخراپەکانیان بۆ زیاد دەکرێت و نەچاکەکانیشیان بۆ کەم دەکرێتەوە ) (١٧).

---

(١٦) (انظر کتاب الحدائق في علم الحدیث والزهدیات لأبن الجوزي ، حققه وعلق علیه مصطفی السبکي) (ج٣)

(١٧) (تیسیر الکریم الرحمن- ج٣-ص٥٩)

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت (لاتزال جهنم يلقى فيها وتقول هل من مزيد؟ حتى يضع فيها رب العزة قدمه فيزوي بعضها الى بعض .تقول : قط ، قط ، وعزتك ) (١٨)

واتە (بەردەوام مرۆڤ و جنۆكە فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە وەدۆزەخیش دەڵێت ئایا زیاتر هەیە فڕێبدرێتە ناومەوە ؟ هەتا پەروەردگاری مەزن پێی پیرۆزی دەخاتە ناوییەوە ، و دۆزەخ دێتەوەیەک ، وەدەڵێت : بەسمە بەسمە سوێند بێت بەعیزەتی تۆ)

بەڵێ ئەوە شوێنی ئەو کەسانەیە کەلەدنیادا گاڵتەیان بەپەیڕەوو بەرنامەی خوادەکرد و ڕێچکەی خوارو خێچی دەستکردی مرۆڤیان گرتبووەبەر ، بۆ هەتا هەتایی لەوێدا دەمێننەوەو بەردەوامیش ئازارونەشکەنجەیان لەسەر زیاد دەکرێت ، وەخواردن و خواردنەوەیان تەنها ئاوی کوڵاو کیم و زوخاوی دۆزەخی‌یەکانە ، هەروەها بەهۆی تاوانەکانیانەوە ڕوویان ڕەش وناشرین دەبێت ، لەهەموو گۆشەیەکی دۆزەخەوە هاواردەکەن و دەڵێن : ئەی دەرگاوانی دۆزەخ ئایا ئیتر کاتی سزا کۆتایی نەهات ؟ خۆمیچمان نەما نەسوتێت ! بەڵام بەنەخێر وەڵامیان دەدرێتەوە و پێیان دەوترێت : (ئێوە هەرگیز تازە بەتەمای ژیانی ئاسوودەیی و خۆشی مەبن ، بەڵکو هەر چاوەڕێی ئەوە بن هەر سزاکانتان لەسەر زیادبکرێت ، و کۆڵی سەرشانتان هێندەی تر قورس و گران بکرێت ، بێدەنگ بن ئەوەندە مەڵێن . بەڵکو جاری واهەیە بەووشەی (فاخسئوا) وەڵامیان دەدرێنەوە کەلەزمانی عەرەبی‌دا بۆ (چغەو حەپەی) سەگ بەکاردێت ، واتە ئەوەندە مەوەڕن ، بەهیچ شێوەیەک پەشیمان بوونەوە دادیان نادات و فریایان ناکەوێت... لەهەموو لایەکەوە ئاگر گەمارۆیان داون : لەلای سەرەوە و لای ڕاست و لای چەپ و لەپێشەوەو لەدواوە دەوری داون و لەناویا نوقم دەبن و دوکەڵ قانیان دەدات و تاریکی باڵیان بەسەر دەکێشێت و خواردن و خواردنەوەیان ئاگرە...جل و بەرگیان ئاگرە ، پێشوودانیان هەر ئاگرە ، هەموو هاودەم و خۆشەویستیان ئاگرەو بەس ، کورسی ئاگرینیان بۆ ڕازاوەتەوە ، هەر ئاوێک کەبیخۆنەوە جەرگ و هەناویان دادەڕزێنێ ، لەهەر لایەکەوە دەیگری هەر هاوارو شین و واوەیلایە ، هەموو داواکارو ئاواتی خوازی مردنن بەڵام نامرن .

---

(١٨) رواه البخاري ومسلم

(ابو هريـرة) (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتـەوە کە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی (ئـەو ئـاگرەی کەلەدنیادا دەیکەنەوە بەشێکە لەحەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ) . (**نـارکم جزء من سبعين جـزء مـن نار جهنم**).

پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لەبارەی فراوانی و گەورەیی دۆزەخەوە فەرموویەتی (**يؤتـى بجـهنم يومئذ لها سبعون الف زمام ، مع كل زمام سبعون الف ملك**)[19].

واتە (لەڕۆژی دوایدا دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار ئەلقەی هەیەو هەر ئەلقەیەکیش حـەفتا هـەزار فریشـتە هـەڵی گرتـووە) خـودا پـەنامان بـدات ، ئـەو فریشـتە زەبـەللاح و گەورانـە حـــەفتا هەزاریان تەنها یەک ئەلقە هەڵدەگرن ، دەبێت دۆزەخ گەورەییەکەی چەند بێت !

بەڵگەی تریـش لەسـەر گـەورەیی دۆزەخ ئەوەیـە کـەخۆرو مـانگ چـەندە گـەورەن کـەچی فـڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە وەک دەفەرموێت : (**الشمس والقمر مكوران في النار**)[20]

واتە : (خۆر و مانگ فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە) .

## سێیەم: دەرگاکانی دۆزەخ و ناوەکانی

دەرگاکانی دۆزەخ ژمارەیان حەوتە وەک پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکی (صحیح) دا ئاماژەی بۆ کردووە

ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت ) فەرموویەتی : (دەرگاکانی دۆزەخ بەو شێوەیە -ئەبو هارون فەرمووی- یەک لەسەر یەکن .

وەدەفەرموێت : (حەوت دەرگای یەک لەسەر یەکن ، یەکەم پڕ دەبێت پاشان دووەم ، پاشان سێیەم ، هەتا هەمووی پڕ دەبێت )[21].

بێگومان ئەم دەرگایانە بەبەزەیی خوای میهرەبان لەڕەمەزاندا دادەخرێن وەک پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی : (**اذا جاء رمضان فتحت ابواب الجنة ، وغلقت ابواب النار...**)[22].

واتە (ئەگەر ڕەمەزان بێت دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن...)

(١٩) (رواه مسلم عن عبدالله بن مسعود)

(٢٠) (سلسلة الاحاديث الصحيحة) (٣٢/١)

(٢١) (ابن كثير/١٦٢/٤)

(٢٢) (الجنة والنار ص/٢٨)

لەڕاستیدا ژیانی (البوار) کەدۆزەخە ژیانێکی پڕ مەرگەسات و نارەحەتی یەو لەچەند دەرگایەک پێک دێت ، بەرزترین دەرگای دۆزەخ ئاسان ترین سزای تیایە ، توند ترین وسەخترین سزاش بۆنزم ترین پلەی دۆزەخە ، هەر دەرگایەک لەدەرگاکانی دۆزەخ ناوێکی تایبەتی هەیە

خوای گەورەو میهرەبان دەفەرمویت **(وان جهنم لموعهم اجمعين ، لها سبعة ابواب لكل باب جزء مقسوم)** (الحجر/٤٣-٤٤) واتە : بەڕاستی دۆزەخ شوێنی بەڵێن پێدراوی هەموویانە ، حەوت دەرگای هەیە بۆهەر دەرگایەکیان لەوانە بەشێکی دیاری کراوی هەیە لەسزاو نارەحەتی )

هەروەها پەروەردگاری مەزن دەفەرمویت: **(ان المنافقين في الدَّرك الاسفل من النار)** (النساء/١٤٥) واتە : بەڕاستی دوو ڕووەکان لەپلەی هەرە خوارەوەی دۆزەخدان

ناوەکانی دۆزەخیش لەچەند سورەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە کەڕیزکردنەکەی -تزیکە- بەم شێوەیە بێت :

## ١) النار

ئەم ناوە لەزۆر سورەتی پیرۆزدا هاتووە وەک خوای گەورە دەفەرمویت

**(ويوم يحشر اعداء الله الى النار فهم يوزعون ، حتى اذا ماجاؤها شهد عليهم سمعهم وابصارهم وجلودهم بما كانوا يعملون)** (فصلت/١٩-٢٠) . واتە : (وەڕۆژی دوژمنانی خوا کۆدەکرێنەوە بەرەو ئاگر راپێچ دەکرێن ریزدەکرێن تائەوانی تر پێیان دەگەنەوە شایەتی ئەدەن گوێیەکانیان وەچاوەکانیان وەپێستیان بەو کارە خراپانەی کەکردویانە شایەتی ئەدەن لەسەریان) .

## ٢) جهنم

وەک خودای گەورە دەفەرمویت **( وان جهنم لموعدهم اجمعين ، لها سبعة ابواب لكل باب منهم جزء مقسوم)** (الحجر/٤٣-٤٤) واتە : بەڕاستی دۆزەخ جێگاو کاتی هەموویانە ، دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە هەر دەرگایەکیش بۆ تاقمێک لەوانە بەش کراوە ) .

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت **(وجيء يومئذ بجهنم يومئذ يتذكر الانسان وآنى له الذكرى ، يقول ياليتني قدمت لحياتي ، فيومئذ لايعذب عذابه احد ولايوثق وثاقه احد)**

(الحشر/٢٣-٢٤) واتە (وەلەو رۆژەدا دەهێنرێت دۆزەخ (بەڵێ) لەو رۆژەدا مرۆڤ پەند وەردەگرێت (بیردەکاتەوە) بەڵام لەکوێ سوودی هەیە بەڵام (بیرکردنەوەو پەشیمانی لەو رۆژەدا هیچ ناگەیەنێت) ئەڵێ خۆزگایە بۆئەم ژیانە نەبڕاوەیە شتێکم ئامادەبکردایە جالەو رۆژەدا هیچ ئازاردەرێ وەک ئەو ﷻ ئازار و سزای نادات ، هیچ کەس وەک خوای گەورە ئەو ناخاتە کۆت و بەندەوە) .

## ٣) سەقەر

وەک خودای گەورە فەرموویەتی (ساصليه سقر . وما ادراك ماسقر لاتبقي ولاتذر ، لواحة للبشر عليه تسعة عشر) (المدثر/٢٦-٢٩) . واتە : (لەدوای ئەوە رایدەکێشمە دۆزەخی ناودراو -سقر- وە تۆ چوزانی ئەو دۆزەخە ناودراوە چییە؟ -ئاگرێکە- نەشتێ دێڵێتەوە و نەشتێ بەرەڵا دەکات ، سوتێنەر و هەڵقرچێنەری پێستی مرۆڤە ، نۆزدە فریشتەی سزای لەسەر دانراوە) .

## ٤) الجحيم

ئەم ناوەش وەکو هەموو ناوێکی دۆزەخ زۆر جار دووبارە بووەتەوە وەک پەروەردگاری مەزن دەفەرموویت: (فإذا جاءت الطامه الكبرى ، يوم يتذكر الانسان ماسعى وبرزت الجحيم لمن يرى رفاما من طغى وآثر الحياة الدنيا ، فان الجحيم هي المأوى) (النازعات/٣٤-٣٩) .

واتە : (جاهەر کاتێ ئەو رووداوە سەخت و گەورەیە بێ ، رۆژێ کەمرۆڤ هەموو کردەوەی خۆی دێتەوە بیر ، دۆزەخ بۆ هەرکەسێ کەدەیبینێ ئاشکرا دەکرێت ، جاهەر کەس کەیاخی بووە وەژیانی ئەم دنیایەی هەڵبژاردبێ ، جابەراستی دۆزەخ جێیەتی) .

هەروەها پەروەردگاری مەزن دەفەرموویت(خذوه فاعتلوه الى سواء الجحيم ، ثم صبوا فوق رأسه من عذاب حميم ذق انك انت العزيز الكريم) (الدخان/ ٤٦-٤٩)

واتە : ئەم کافرە تاوان بارە بگرن و رایکێشن و فڕێی بدەنە ناودۆزەخەوە لەپاشدا سزای سوتێنەری بەسەردا بڕێژن دەبچێژە بەراستی تۆعەزیزو کەریمی !!!(بەگومانی خۆت) )

## ٥ ) السعير

وەک خوای گەورە فەرموویەتی (انا اعتدنا للكفرين سلاسل واغلالا وسعيرا) (الانسان/٤) واتە (بەڕاستی ئێمە بۆکافران کۆت و زنجیرەو ئاگری سوتێنەرمان ئامادەکردووە )

## ٦ ) لظى

خوای گەورە دەفەرمویت (كلا انها لظى ، نزاعة للشوى ، تدعوا من ادبر وتولى وجمع فاوعى) (المعارج/١٥-١٨) . واتە نەخێر وانییە بەڕاستی ئەوە سوتێنەری ئاگرە ، دەست و پێو دەم و چاو دائەماڵێ (پێستەکەی هەڵئەکەنێ ) بانگی ئەو کەسانە دەکات کەپشتیان لەحەق کردووە ماڵی کۆکردۆتەوە ) .

## ٧ ) الحطمة

خوای پەروەردگار دەفەرمویت : (كلا لينبذن في الحطمة وما ادراك ما الحطمة ، نار الله الموقدة التي تطلع على الافئدة انها عليهم مؤصدة في عمد ممدة) (همزة/٤-٩)

واتە (نەخێر وانییە باوانەزانن ، سوێند بەخوا فڕێ ئەدرێنە ناوئاگرێکی بەهێزی تێک شکێنەرەوە ، تۆ نازانی ئەو ئاگرە چییە ، ئەو ئاگرەیە هەرچی تێکرا دەیهاڕێ و دایئەپاچێ ، ئەو ئاگرەی ناوبرا هی خوایە کە هەڵگیسێنراوە بەفەرمانی خوا ، ئاگرێکە ورووژم دەباتە سەر دڵەکان و دایان ئەگرێ ، بەڕاستی ئەو ئاگرە دانراوە لەسەریان قاپییەکە قوفڵ دراوە لێیان وان لەناو چەند عەمودێکی داخراو کەبەکەلەپچە کراوی بەستراوی! ) .

## ٨ ) هاوية

وەک خوای گەورە و میهرەبان دەفەرمویت : (واما من خفت موازينه ، فامه هاوية ، وماادرك ماهي ، نار حامية) (القارعة/ ٨-١١) . واتە : (وەئەو کەسەی کێشانەکەی سووک بێت بەم ڕەنگە چاکەی هەر نەبێ ، یان ئەگەر بوبێت لای خوا بێ‌نرخن ، دایکی ئەو کەسە هاویەیە ، واتە جێو شوێنی ئەوەیە تۆ چوزانی هاویە چییە ئەو هاویە ئاگرێکی بڵێسە داری داگیرساوە

# چواردم : شیو و دۆڵەکانی دۆزەخ

دۆزەخ جیهانێکی زۆر فراوان وگەورەیە ، سەرەتا وکۆتایی‌یەکەی بە تەواوی نازانرێت ، لە چەند شیوو دۆڵ و شاخێک پێک دێت ، هەندێ ووشە کە لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەی بەنرخدا هاتوون ، کە هەریەکەیان واتای جۆرێک لە جۆرەکانی سزا دەگەیەنێت ، هەندێ لە پێشینە چاکەکان (سلفي صالح) ئەو ووشانەیان بە شیوەکانی دۆزەخ لێک داوەتەوە

هەروەک خوای گەورە دەفەرمویت (فخلف من بعدهم خلف أضاعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غيا) (مريم/٥٩) واتە : (بە دوای ئەو زانایانەدا کۆمەڵێک هاتن نوێژیان زایە دەکردو شوێن ئارەزووەکانیان دەکەوتن و سەرگەردان بوون ، جا ئەم کۆمەڵە بە تۆڵەی تاوان وئەنجامی بێ فەڕی خۆیان دەگەن) لێرەدا ووشەی (غـي) هاتووە کە دەڵێن : شیوێکە لە شیوەکانی دۆزەخ . هەروەها دەفەرمویت : (ومن يفعل ذلك يلق اثاما) (الفرقان/٨) واتە (هەرکەس ئەم گوناهانە بکات بە تاوانی ناهەمواری خۆی دەگات لەدۆزەخدا)

جا لێرەشدا ووشەی (أثام) هاتووە کە زانایان دەفەرموون : (ناوی شیوێکی دۆزەخە ، هەروەها ووشەی (ويل) لە سورەتی(ويل للمطففين) (المطففين/١) دا هاتووە ، کە دەڵێن : هاوارە، یاخود شیوێکی هەڵەت وسەختە لە دۆزەخدا ، ئەو کەسانەی تێدەچن کە تەرازوو بازی دەکەن .

وەک لە فەرمودەیەکیشدا هاتووە کە دەفەرمویت : (تفسير الويل لوادى في جهنم يهوي فيه الكافر اربعين خريفا قبل ان يبلغ قعره) [٢٣] واتە : (تەفسیری وەیل بە شیوێک لە شیوەکانی دۆزەخ کراوە بێ باوەڕی تێ فڕێ دەدرێت کە بە چل پایز هێشتا ناگاتە بنکەکەی) [٢٤]

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ﷺ) فەرموویەتی : (ان من جهنم لواديا تستعيذ جهنم من ذلك الوادي كل يوم اربع مائة مرة أعد المرائين من أمة محمد) [٢٥] واتە : (بە ڕاستی لە دۆزەخدا شیوێک هەیە کە دۆزەخ هەموو رۆژێک چوار سەد جار پەنا دەگرێ بە خوا لەو شیوە ، ئامادە کراوە بۆ ئەوانەی رووپامایی دەکەن لە ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) )

---

(٢٣) پێشەوا ترمزی لە تەفسیری سوورەتی (الأنبياء) دا هێناویەتی ، هەروەها پێشەوا (أحمد) و (حاکم) گێراویانەتەوە

(٢٤) أنظر : عقيدة المؤمن –أبو بكر جابر الجزائري-

(٢٥) الترغيب و الترهيب رقم الحديث ٥٣٨١ ، ضعيف ، قال الهيثمي في مجمع الزوائد ج١٠ ص٢٢٢

هەروەها ئیمامی عەلی (ﷺ) فەرموویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **(نعوذوا بالله من الجب الحزن أو وادي الحزن ، قيل : يا رسول الله وما جب الحزن أو وادي الحزن ، قال : واد في جهنم تتعوذ منه جهنم كل يوم سبعين مرة أعده الله للقراء المرائين)** (٢٦)

واتە (پە نا بگرن بە خوا لە شیوی خەفەت ، ووترا ئەی پێغەمبەری خوا شیوی خەفەت چی‌یە؟ فەرمووی شیوێکە لە دۆزەخدا دۆزەخ هەموو ڕۆژێک حەفتا جار پەنای پێ دەگرێت ئامادە کراوە بۆ قورئان خوێنە ڕووپامایی کەرەکان) (٢٧)

عبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) فەرموویەتی لەبارەی **(فسوف يلقون غيا)** (مريم/٥٩) **قال : (واد في جهنم يقذف فيه الذين يتبعون الشهوات)** (٢٨) واتە: (غیا) شیوێکە لە دۆزەخ ئەوانەی تێ فڕێ دەدرێ کە شوێن هەواو ئارەزووەکانیان دەکەون)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی لە بارەی **(سأرهقه صعودا)** (المدثر/١٧) **(جبل من نار يكلف صعوده ، فإذا وضع يده عليه ذابت ، وإذا رفعها عادت ، وإذا رجعه عليه ذابت ، فإذا رفعها عادت ، يصعد سبعين خريفا ثم يهوى كذلك)** (٢٩)

**واتە:** پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەی ئەم ئایەتەوە فەرموویەتی (صعود) شاخێکە لەئاگر تێدی لێ دەکرێ کە سەرکەوێ پیایدا ، کە دەستی دەخاتە سەری دەتوێتەوە ، و کە دەستی بەرز دەکاتەوە دەگەڕێتەوە کە دەستی دەخاتەوە سەری دەتوێتەوە کە هەڵی دەگرێت لەسەری دەگەڕێتەوە ، حەفتا پایز سەردەکەوێت و پاشانیش حەفتا پایز دەکەوێتە خوارەوە) .

(٢٦) رواه البيهقي بإسناد حسن في البعث و النشور ٥٣٠ ، أنظر : الترغيب و الترهيب رقم ٥٣٧٩

(٢٧) (١- الترغيب و الترهيب رقم الحديث /٥٣٨١ ، ضعيف قال الهيثمي في مجمع الزوائد ١٠/٢٢٢) (٢-رواه البيهقي بإسناد حسن ، رواه البيهقي في البعث و النشور /٥٣٠ بذوانة الترغيب و الترهيب رقم الحديث ٥٣٧٩)

(٢٨) (ضعيف قال الهيثمي في مجمع الزوائد ٧/٥٥ رواه الطبراني باسانيد ، و رجاله بعضها ثقاة إلا أن ابا عبيدة لم يسمع من أبيه (الترغيب و الترهيب ص ٣٦٥)

(٢٩) (رواه احمد و الحاكم من طريق دراج وقال : صحيح للإسناد و رواه الترمذي من طريق إبن لهيعة عن دراج مختصرا قال : الصعود جبل من نار يصعد منه الكافر سبعين خريفا ، و يهوى به كذلك أبدا) واتە : (سەعود شاخێکە لە ئاگر کافری بەسەردا سەر دەخرێت حەفتا پایز وە لێوەی دەخرێتە خوارێ بەهەمان شێوە هەتا هەتایە) و قال : غريب لانعرفه معروفا إلا من حدث إبن لهيعة ، ضعيف رواه احمد (٣/٧٥) و الحاكم و الترمذي (٣٣٢٦) و البيهقي في البعث و النشور رفي إسناده دراج عن ابي الهيثم ، و هو ضعيف ، (صعودا) عقبة و شاقة المصعد)

وە لە ڕیوایەتەکەی تردا (صعود) شاخێکە لە ئاگر کافر حەفتا پایز سەردەکەوێت ، وە دەکەوێتە خوارەوە ، بەو شێوەیە هەتا هەتایە ) (٣٠) .

## پێنجەم : سوتەمەنی دۆزەخ

سوتەمەنی دۆزەخ بریتی‌یە لەئادەمیزاد و بەرد ، هەروەکو خوای گەورە ئاماژەی بۆدەکات و دەفەرموێ : **(یاایها الذین امنوا قوا انفسکم واهلیکم نارا وقودها الناس والحجارة)** (التحریم/٦) . واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و ماڵ و منداڵتان لەئاگرێک بپارێزن کەسوتەمەنی‌یەکەی خەڵک و بەردە )

جا هەرچەندە خوای گەورەو بەدەسەڵات دەتوانێت هەموو جۆرەبەردێک بکات بەسوتەمەنی دۆزەخ ، بەڵام هەندێ لەهاوەڵان دەڵێن : ئەو بەردە بریتی‌یە لەبەردی گۆگرد (کبریت) کەزۆر گەرم دەبێت و بۆنی ناخۆشەو چاکتر بەپێستی مرۆڤەوە دەنوسێت .

(ابن رجب) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی (زۆربەی موفەسیرەکان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە بەردی گۆگرد ئاگری پێدادەگیرسێت ، وە ووتراوە : پێنج سیفات هەیە کەئێش و ئازار زیاتر دەکات کەلەغەیری گۆگرد لەهیچی تردا نی‌یە ، زوداگیرسان ، بۆنی زۆرناخۆش ، زۆری دووکەڵ ، توند بەلاشەوە دەلچکێت ، لەکاتی گڕسەندنی تینی گەرمی زۆر بەهێزە ) (٣١)

عبد اللّٰه‌کوڕی مسعود (ﷺ) فەرموویەتی : (**هي حجارة من كبريت ، خلقها الله يوم خلق السموات والارض في سماء الدنيا يعدها الكافرين**) (٣٢) . واتە : (ئەمە بەردی گۆگردە خودا دروستی کردووە کاتێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە لەئاسمانی یەکەم ئامادەی دەکات بۆ بێباوەڕان ) .

لەسوتەمەنی‌یەکانی تری ئاگر بتە دروست کراوەکانە وەک خوای میهرەبان فەرموویەتی: **(انكم وماتعبدون من دون الله حطب جهنم انتم لها واردون . لوان هؤلاء الهة ماوردوها وكل فيها خالدون)** (الانبياء/٩٨-٩٩)

---

(٣٠) بڕوانە (الترغيب و الترهيب من الحديث الشريف) الإمام عبد العظيم بن عبد القوى المنذرى حققه و قدم لـــه و علق عليه (محى الدين ديب مستو – سمير أحمد العطار -يوسف على بديوى

(٣١) (الجنة والنار ص/٣١)

(٣٢) (رواه ابن جرير ، وابن ابي حاتم ، والحاكم في المستدرك ، وقال بهذا القول ابن عباس ومجاهد وبن جريج)

واتە (ئەوە ئەوانەیش لەغەیری خودا دەیپەرستن دەبنە دارو سووتەمەنی دۆزەخ و ئەوەدەداوێڕیدا دەبرێن ، ئەگەر ئەوانەی ئێوە دەتان پەرست خودای حەق بوونایە ، نەدەخرانە ناو دۆزەخەوە ، وەهەموو تیایدا بەنەمری دەمێننەوە ) .

## شەشەم : مارو دوو پشکی دۆزەخ

لەبەرئەوەی خوا پەنامان بدات دۆزەخ لانەی سزاو ناڕەحەتی یە ، جاسزاکانی جۆراو جۆرن کەچاو نەیبینیون و گوێ نەیبیستوون ، بۆیە بوونی ماری ترسناک و دوپشکی تۆقێنەر لەدۆزەخدا ئاسایی یە .

هەروەکو (ابن عباس) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ : **(الذين كفروا وصدوا عن سبيل الله زدناهم عذابا فوق العذاب بما كانوا يفسدون)** (النحل/٨٨) واتە : (ئەوانەی بێباوەڕبوون لەڕێگای ڕاست لایاندا ، سەرەڕای سزاکانی خۆیان سزامان بۆ زیاد کردوون) ، دەفەرموێت : ئەو سزا زیادکردنە دووپشکی گەورەن ئەوەندەی هێستر دەبن .

هەروەک پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی کە: **( ان في النار حيات كامثال اعناق البخت ، تلسع احداهن اللسعة فيجد حرها سبعين خريفا ، وان في النار عقارب كامثال البغال المولفة تلسع احداهن اللسعة فيجد اربعين سنة )** [٣٣]

واتە : لەناوئاگردا ماری وای تیایە وەک ملی حوشتر وایە ، بەهەرکەسێکیانەوە بدات حەفتا پایز هەست بەئێشی گەرمی یەکەی دەکات ، وەدووپشکی وای تیایە بەهەر کەسێکیانەوە بدات چل ساڵ هەست بەئازارەکەی دەکات .

**قال ابن مسعود (رضي الله عنه) في قوله تعالى: ( زدناهم عذابا فوق العذاب ) قال : زيدوا عقارب كالنخل الطول )** [٣٤] . واتە : لەبارەی ئەو ئایەتەوە فەرموویەتی : دووپشکی گەورەی وەهایان بۆ زیاد دەکرێت کە کەڵبەیان هێندەی دارخورمای درێژ درێژە ) .

---

(٣٣) رواه الحاكم و قال صحيح الإسناد

(٣٤) رواه ابو يعلى و الحاكم موقوفا و قال صحيح على شرط الشيخين

## حەوتەم : دۆزەخی یەکان کێن ؟

دۆزەخی یەکان ئەو کەسانەن کەدوای هاتنی ڕۆژی دوایی -قیامەت- و لێپرسینەوەو دادگایی کردنی مرۆڤ بەهۆی زۆری تاوانەکانیانەوە بەرەو دۆزەخ دەبرێن . واتە بریتین لەبێباوەڕەکان و دووڕووەکان و ستەم کارو تاوانبارەکان ، کەلەتاقی کردنەوەی ژیانی دنیا دەرناچن ، جائەو بارو دۆخەی ئەوان تیادەژین گەلێک سەخت و دژوارە ، باپێکەوە چاوێک بخشێنین بەو ڕەوش و ئاستەنگەی کەئەوانی تێدەکەون لەبەر ڕۆشنایی قورئـان و فـەرموودە ڕاستەکاندا -کەتاکە سەرچاوەی وەرگرتن و هەڵهێنجانی زانیارین بۆئێمە دەربارەی دۆزەخ و دیمەنەکانی- لەپێشوازی لێکردنیان و چۆنێتی بردنیان بۆدۆزەخ خواردن و خواردنەوەو ڕاخەریان و چەند بارو گوزەرانێکی تر کەهەموویان دەبنە مایەی ڕیسوایی و سەرگزێو ئابووتی دۆزەخی یەکان .

## هەشتەم: ڕاپێچ کردن و پێشوازی لێکردنیان وبردنیان بۆ دۆزەخ

خوای گەورە دەفەرموێت **(وسيق الذين كفروا الى جهنم زمرا ، حتى اذا جاؤها فتحت ابوابها وقال لهم خزنتها الم يأتكم رسلا منكم يتلون عليكم آيات ربكم وينذرونكم لقاء يومكم هذا ؟ قالوا بلى ولكن حقت كلمة العذاب على الكافرين ، قيل ادخلوا ابواب جهنم خالدين فيها فبئس مثوى المتكبرين)** (الزمر ٧١-٧٢) .

واتـە : بێباوەڕەکان پـۆل پـۆل بـەرەو دۆزەخ ڕاپێـچ دەکرێـن ، تـاکو دەگەنـە لای دۆزەخ و دەرگاکانی دەکرێنەوە . ئنجا دەرگاوانەکانی دۆزەخ پێیان دەڵێن : ئایا لەخۆتان پێغەمبـەرانتان بۆنەهات ، ئایەتەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێننەوە و ئاگاداری ئەم دیدارەی ئەم ڕۆژتان بکەن و بتانترسێنن ؟ دەڵێن : بەڵێ !! بەڵام بڕیاری سزا بەسەر بێباوەڕاندا دراوەو چەسپاوە ، پێیان دەڵێن بچنە ژوورەوە لـەدەرگاکانی دۆزەخـەوە بەهـەتا هـەتایی بمێننـەوە ، کەخراپترین شـوێنی خۆبەزل زانەکانە . )

هەروەها خوای میهرەبان لەجێیەکی تردا دەفەرموێت : **(يعرف المجرمون بسيماهم فيؤخذ بالنواصي والاقدام ، فبأي الآء ربكما تكذبان ، هذه جهنم التي يكذب بها المجرمون)** (سورة الرحمن الآية ٤١-٤٤)

واتە  خراپەکاران بەدەم وچاویانـا دەناسرینەوە واتـە ڕەشن ، وەپانەکێشرین بەناوچەوان و قاچەکانیان ، بەچ نیعمەتێکی پـەروەردگارتان ئـەی مرۆڤ و جنۆکـە بـەدرۆی ئـەزانن ئـەوە ئـەو دۆزەخەیە ببینن ئەی خراپەکاران کەبەدرۆی ئەزانن)

وەخوای گەورە و میهرەبان دەفەرموێت : (ونسوق المجرمين إلى جهنم وردا) (مريم/٨٦) .

واتە  (ئەو تاوانبارانە بەتینوێتی بەرەو دۆزەخ لێدەخورین) .

وە هەروەها خوای گەورە و میهرەبان دەفـەرموێت : (ادخلوا ابواب جهنم خالدين فيها فبئس مثوى المتكبرين) (غافر/٧٦) واتە  (لەدەرگاکانی دۆزەخەوە بڕۆنە ژوورێ لەوێ ئـەتیس بن ، چەند جێیەکی خراپە بۆ فیز زلان)

دەبینی چۆن پێشوازی‌یەکیان لێدەکرێت ! چ پرسیارو ڕوشکێنێک دەکرێن !! بەچ نمایشێکی سەرشۆڕیانەوە بەرەو دۆزەخ بەڕێیان دەکەن؟!!

پـاش دەرچوونی بڕیاری کۆتـایی لەلایـەن خـوای گـەورەوە ، ئنجـا بێ‌بـاوەڕان لەسـەر ڕوو ڕادەکێشرێن و بـەرەو دۆزەخ بـەڕێدەخرێن وەک خـوای گـەورە دەفـەرموێت : (الذين يحشرون على وجوههم الى جهنم أولئك شر مكانا وأضل سبيلا) (الفرقان/٣٤) .

واتە  (ئەوانـەی لەسـەر ڕوویـان ڕادەکێشـرێن بـەرەو دۆزەخ ، ئەوانـەن کـەخراپترین جێگایان هەیەو گومڕاترین ڕێگەیان هەڵبژاردووە)

هەروەها خودای گەورەو میهرەبان فەرمویـەتی : (ومن يهد الله فهو المهتد ومن يضلل فلن تجد لهم اولياء من دونه ونحشرهم يوم القيامة على وجوههم عميا وبكما وصما مأواهم جهنم كلما خبت زدناهم سعيرا) (الإسراء/٩٧)

واتە : (هەرکەس خوا ڕێنمایی بکات هەرئەو کەسە ڕێنمایی وەرگرتووەو کەوتۆتـە سـەر ڕێگەی ڕاست  هەرکەسیش گومڕابێت هەرگیز دۆست و یارمەتی دەرو کۆمەکی کەری نی‌یە بیخاتـە سەر ڕێگەی ڕاسـت . زیندوویـان ئەکەینـەوە وەکۆیـان ئەکەینـەوە وەلـەڕۆژی دواییدا بەسـەر ڕوو دەم و چاویان دا لەکاتێکدا کوێرن و لاڵـن و کـەڕن و قـەرارگاو شـوێنی نیشـتەجێیان دۆزەخـە هـەرجارێ بڵێسەی ئەنیشێتەوە ، زیادیـان ئەکـەین لـەبارەی بڵێسـەی ئاگرەکـەوە بـەم ڕەنگـە ئـەو پێست و گۆشتە خوراوانە وەک خۆیان لێدەکەینەوە

پێغەمبەریش (درود و سلاوی خوای لێبێت) چۆنیەتی ئەو بەڕوودا کەوتنەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرمویت : (ان الذي امشاه على رجله قادر على ان يمشيه على وجهه) [٣٥] واته (ئەو کەسەی لەدنیادا لەسەر پێ دەیبات بەڕێوە ، دەتوانێ ڕۆژی دوایی لەسەر ڕوو بیبات بەڕێوە )

ئەمە لەوەلامی پرسیاریکدا فەرمووی کە وتیان چۆن خەلکی لەسەر ڕوو دەڕۆن ؟

## نۆهەم :خواردنی دۆزەخی یەکان

خوای پەروەردگار دەفەرمویت: **(ليس لهم طعام الا من ضريع ، لايسمن ولايغني من جوع)** (الغاشية/٦-٧) واته: (هیچ خواردنێکیان نادرێتێ تەنها (ضريع) نەبێت -جۆرە ڕوەکێکە هیچ گیان دارێک نایخوات لەبەرئەوەی دڕکاویی و پیسە- نەپێی قەڵەو دەبن و نەهیچ برسێتیشیان پێی لادەچێت )

خوای گەورە لە جێیەکی تردا دەفەرمویت **(ان لدينا انكالا وجحيما،وطعاما ذاغصة وعذابا اليما )** (المزمل /١٢-١٣).... واتە بەڕاستی کۆت و بەندی قایممان لایە لە ڕۆژی دوایی دا کە بێباوەڕان پێ‌پێوەند دەکرێت و ئاگری بڵێسە داریان بۆئامادەکراوەو خواردنی قیزەونو دڕکاویان پێدەدرێت و سزای بە ئێشیان پێدەچێژرێت ).

هەروەک خوای گەورە لە شوێنێکی تردا دەفەرمویت : **(ثم انكم ايها الضالون المكذبون ، لآكلون من شجر من زقوم ، فمالئون منها البطون ، فشاربون عليه من الحميم ، فشاربون شرب الهيم ، هذا نزلوهم يوم الدين)** (الواقعة/٥١-٥٦) .

واتە : (پاشان ئێوە -ئەی گومڕایانی بێبڕوا بێگومان لەدرەختی ژەقنەبووت (زەقوم) ی ناودۆزەخ دەخۆن ، لەبرسانا ووزگی لێپڕدەکەن ، ئنجا ئاوی لەکوڵ بەسەردا دەخۆنەوە ، بەوێنەی خواردنەوەی حوشتری تینوو ، ئەمە میوانداری ئەوانە لەڕۆژی سزادا ) ، -هیم- حوشتری تینووە کەهەر ئاو دەخواتەوە تێرنابێت تاکو سەرەنجام دەتەقێت .

---

(٣٥) تفسير القرآن العظيم لحافظ ابن كثير

خوای گەورە باسی درەختی ژەقنەبووت (شجرة زقـوم) دەكـات و دەفـەرمویت (انها شجرة تخرج من اصل الجحيم ، طلعها كأنه رؤوس الشياطين ، فانهم لآكلون منها فمالئون منها البطون ، ثم ان لهم عليها لشربا من حميم ، ثم ان مرجعهم لإلى الجحيم) (الصافات/ ٦٤-٦٨)

واتە: (ئەو داری زەقنەبووتە داریکە لەتەخت و بیخی دۆزەخەوە دەردەچێت و لـق و پۆپەكانی بەدەرگاكانی دۆزەخـدا بلاودەبێتـەوە ، كەبەرەكەی وەك كەللەسەری شـەیتانەكان وایە ، جانەوەر دۆزەخی‌یانە لیی دەخۆن وزگی لێپر دەكەن ، پاشـان بەسـەری دا ئـاوی كولاویان پیدەدریت و دەیخۆنەوە ، پاشان بێگومان گەرانەوەیان هەر بۆلای دۆزەخە

پیغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمویت : (لو ان قطرة مـن الزقـوم قطـرت في دار الدنيـا لأفسدت على اهل الدنيا معايشهم فكيف بمن يكون طعامه) [٣٦]

واتە: (ئەگەر یەك دلۆپ لەو ژەقنەبووتە بتكیتە ژیانی دونیـاوە ئـەوا گوزەران لەخەلكی سەر زەوی تیك دەدات ، چ جای ئەوەی كەئەمە خواردنەكەی بیت .

خوای گەورە لەئایەتیكی تردا دەفەرمویت (فليس له اليوم هاهنا حميم ، ولاطعام الا من غسلين) (الحاقة/٢٦-٢٧) .

واتە : (لەو رۆژەدا لەوێ هیچ دلسۆزو خۆشەویستیكی نی‌یەو هیچ خواردنیكی نی‌یە جگە لەكیم و زوخاوێ كەلەلاشەیاندا دەچۆرێتەوە) .

## دەهەم : خواردنەوەی دۆزەخی‌یەكان

خوای گەورەدەفەرمویت: (و يسقى من ماء صديد يتجرعـه ولا يكـاد يسيغه و يأتيه الموت من كل مكان ،وما هو بميت ، و مـن ورائـه عـذاب غليظ) (الإبراهيـم ١٦-١٧) . واتـە : (ئەو بێباوەڕو تاوان بارەی لەدۆزەخدایە -لەكیماو زوخاو تیر ئـاو دەكریـت قومـی لیدەدات و خەریكە بۆی قـووت نـەچیت ، وەلەهەمولایەكـەوە مردنـی بۆدیـت بـەلام نـاشمریت ، وەلـەدوای ئـەوەش سزایەكی توندی سەخت چاوەڕیی دەكات) .

وەلەئایەتیكی‌تردا پـەروەردگاری مـەزن دەفـەرمویت : (وسقوا ماء حميما فقطع امعائهم) (محمد/ ١٥)

(٣٦) رواه الترمذي ج١٠ ص٥٤ و قال هذا حديث حسن صحيح ، و رواه ابن ماجة ج١ ص٣٠١

واتە (لەئاوێکی کوڵاو ئاو دەدرێن کەگەڵ خواردنەوەیدا هەموو ڕیخۆڵەکانیان دەبچڕێنێت)

هەروەها دەفەرموێت: (يصهر مافي بطونهم والجلود ، ولهم مقامع من حديد ، كلما ارادوا ان يخرجوا من الغم اعيدوا فيها ، وذوقوا عذاب الحريق) (الحج/١٩-٢١)

واتە: (بە ئاوێکی کوڵاو -کە دەرخواردیان دەدرێت- هەرچی ناوسکیانە دادەپلۆخێت و پێستەکەشیان دەتوێنێتەوە ، وە چەندەها گورزی ئاسنینیان بۆ دانراوە ، هەرکاتێکیش بیانەوێت لە دۆزەخ بێنە دەر دەخرێنە ناوی پێیان دەگوترێت بچێژن سزای سوتێنەر)

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : (و إن يستغيثوا يغاثوا بماء كالمهل يشوي الوجوه بئس الشراب و ساءت مرتفقا) (الكهف/٢٩) واتە (ئەگەر لە تینوانا هاوار بکەن ، ئەوا بە ئاوێکی کوڵاوی تێکەڵ -وەک خڵتەی زەیت- فریایان دەخرێت کاتێک نزیکی دەمیان خرایەوە دەست بەجێ تینەکەی دەم و چاویان دەبرژێنێت و دایدەپلۆخێنێت ، ئای خواردنەوەیەکی ئێجگار خراپ و شوێن و ڕێگەیەکی سامناک و ناخۆشە

خوای گەورەو میهرەبان فەرموویەتی (أذلك خير نزلا أم شجرة الزّقوم ، إنا جعلناها) (الصافات/٦٢)

واتە : (درەختی زەقوم لەوانەیە جۆرە درەختێکی تایبەت بێت کە لق و پۆپەکانی هەموودۆزەخ داگیر دەکات) ئەوەش بۆچوونی هەندێک لە زانایانە ، قەتادە دەفەرموێت کاتێ باسی درەختی زەقوم کرا بێبڕواکان کەوتنە ووتە ووت و سەر لێ شێواوی ، ووتیان هاوەڵەکان دەڵێت لە ناو دۆزەخدا درەختێک هەیە و ئاگری درەخت دەسوتێنێت

بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (إنها شجرة تخرج في أصل الجحيم) (الصافات/٦٤)

واتە: (درەختێکە لە بنی دۆزەخ دەردەچێت) ئاگری دەرخوارد دراوەو لێی دروست بووە )

## یانزە : پۆشاکی دۆزەخی یەکان

دەربارەی جل و بەرگی دۆزەخی یەکان خوای گەورە دەفەرموێت (و ترى المجرمين يومئذ مقرنين في الأصفاد ، سرابيلهم من قطران و تغشى وجوههم النار) (إبراهيم/ ٤٩-٥٠)

واتە دەبینی لەو ڕۆژەدا تاوانباران کۆت و زنجیر کراون و پۆشاکیان لە (قطـــــران کەمادەیەکی تراوەیە وەک قورقوشم) بۆ دروست دەکرێت ، وە ئاگر دەم و چاویان دادەپۆشێت و دەیسوتێنێت) لە تەفسیری (إبن كثير) دا هاتووە (سرابيل) کۆی (سربال) ە واتە (شەرواڵ).

(أبو مالك) ی (أشعري) دەفەرمویت (پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (والنائحة إذا لم تتب قبل موتها، تقام يوم القيامة و عليها سربال من قطران و درع من جرب) (٣٧)

واتە (ئەو ئافرەتانەی مردوو دەلاوێننەوە -کە پێی دەڵێن (نائحـــة)- گەر تەوبە نەکات و پەشیمانی دەرنەبڕێت پێش مردنی ، ئەوا لە ڕۆژی دوایی‌دا زینـدوو دەکرێتـەوە بـە جۆرێک پۆشاکێکی لە (قطران) لە بەردایە و زرێ پۆشێکی لە مسی تواوە پۆشیوە ،

خوای گەورەش دەفەرمویت (إن الذين كفروا قطعت لهم ثياب من نار، يصب من فوق رؤوسهم الحميم) (الحج/٢٠)

واتە (ئەوانەی کە بێ باوەڕن پڕ بە بەری خۆیان پۆشاکی ئاگرینیان بۆ دەبڕێت و ئاوی ل کوڵ دەکرێت بەسەر سەریاندا ، وە هەندێ لە زانایان دەفەرموون : چونکـە جل و بەرگەکەیان ل مسی تواوەیە ، بەسەریاندا دەتوێتەوەو دێتەخوارەوە و دەیان سوتێنێت)

لە (سمرة) ی کوڕی (الجنـــدب) ەوە (ﷺ) گێڕاویەتـەوە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی : (منهم من تأخذه النار إلى ركبته، و منهم من تأخذه إلى حنجرته، و منهم من تأخذه النار إلى عنقه، و منهم من تأخذه النار إلى ترقوته) (٣٨)

واتە : (لەو دۆزەخیانە کەسی وایان هەیە ئاگرەکە تا ئەژنۆی هـاتووە ، وە کەسی وایان هەیە تاکو ناوکی هاتووە ، هەندێکی تریان هەتا گەردنی هاتووە ، هەندێکی تریشیان هەتا قوڕقوڕاگێ هاتووە) .

## دوانزە : ڕاخەری دۆزەخی‌یەکان

خوای گەورە دەفەرمویت : (لهم من جهنم مهاد و من فوقهم غواش) (الأعراف/٤١)

واتە : (بێباوەڕان -ڕایەخیان هەر لە دۆزەخەو لە ئاگری دۆزەخ لێفەیان دەدرێت بەسەردا) .

وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویت : (لهم من فوقهم ظلل من النار و من تحتهم ظلل) (الزمر/١٦) واتە : (لە سەریانەوە سێبەرێکە -واتـە بڵێسـە- ی ئـاگرە و لـە ژێریشیانەوە بە هەمان شێوە)

---

(٣٧) رواه مسلم

(٣٨) رواه مسلم

هەروەها دەفەرموێت (انطلقوا إلى ظل ذي ثلاث شعب ، لا ظليل ولا يغني من اللهب) (المرسلات/٣٠-٣١)

واتە (دەرچن و بڕۆن بۆلای سێبەرێک کە سێ لقی لێ دەبێتەوە ، هەرکەس بچێتە ژێری نە سێبەری بۆ دەکات و نە دادی دەدات و پەنای دەدات لە بڵێسەی ئاگری دۆزەخ کە لە هەموو لایەکەوە پەلاماری بێ بڕوایان دەدات) .

## سیانزە : کۆت و زنجیری دۆزەخی‌یەکان

بێگومان جۆرێک لە ئەشکەنجەکانی دۆزەخ بریتی‌یە لە کۆت و زنجیر ، جا کاتێک بە تەواوی سزا دەست پێ دەکرێت ، کە دەست و پێ کۆت وزنجیر کرابێت و ئەو کەسەی سزا دەدرێت ناتوانێت هیچ دەس بجوڵێنێت و بەرگری‌یەک لە خۆی بکات ، هەرچەندە ئازار بدرێت هیچی لە دەست نایەت ، گەرچی هەر پەلە قاژەیش بێت ، لەبەر ئەمەشە کە کۆت و زنجیر لە ناو دۆزەخدا هەیە .

هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت : (إنا اعتدنا للكافرين سلاسل و أغلالا و سعيرا) (الإنسان/٤٠) واتە : (ئێمە چەندەها زنجیری درێژمان ئامادە کردووە بۆ ڕاکێشانی بێ باوەڕان و چەند کۆتێک بۆ گەردنیان و پێوەن کردنیان و ئاگری داخراویش بۆ سزا دانیان و سوتاندنیان) .

هەروەها خوای بالا دەست دەفەرموێت (إنا لدينا أنكالا و جحيما و طعاما ذا غصة ، و عذابا أليما) (الزمر/١٢-١٣) واتە : (بەڕاستی کۆت و بەندی قایممان لایە لە ڕۆژی دوایی‌دا کە بێ باوەڕانی پێ پێوەند دەکرێت ئاگری بڵێسە داریان بۆ ئامادە کراوەو خواردنی قیزەوەن و دڕکاویان پێ دەدرێت و سزای بە ئێشیان پێ دەچێژرێت) .

دیسان خوای گەورە دەفەرموێت : (خذوه فغلوه ، ثم الجحيم صلوه ، ثم في سلسلة ذرعها سبعون ذراعا فاسلكوه) (الحاقة/٣٠-٣١)

واتە (فەرمان دەدەین بە چاودێری دۆزەخ و پێی دەڵێین : (ئەو تاوانبارە بگرن و زنجیری کەن و بیکەیەننە دۆزەخ و فڕێیدەنە ناوی، پاشان بە زنجیرێکی حەفتا گەزی ببیەستنەوە)

لە فەرموودەیەکیشدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : (ان اهل النار يكون حتى لو أجريت السفن في دموعهم لجرت و انهم ليبكون ، الدم يعنى مكان الدمع) [٣٩]

(٣٩) رواد الحاكم و قال صحيح و وافقه الذهبي أنظر الترغيب و الترهيب ج٤ ص٤٩٣

واتە (دۆزەخی یەکان ئەوەندە دەگرین ئەگەر کەشتی لەفرمێسکیاندا بکەوێتە بێ ئەوەی دەتوانێت بڕوات ، وە گریانەکەشیان خوێنە لە جیاتی فرمێسک) .

## چوارده : گەورەیی دۆزەخی یەکان و ناشیرینی شێوەیان

لە(أبو هريرة)ەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **(ما بين منكبي الكافر مسيرة ثلاثة أيام لراكب مسرع)** [٤٠] واتە (نێوانی هەردوو شانی بێ باوەڕ ئەندازەی سێ ڕۆژە ڕێیە بە سواری وڵاخێک کە بە خێرایی بڕوات)

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی : **(ضرس الكافر أي ناب الكافر مثل أحد و غلظ جلده مسيرة ثلاث)** [٤١] واتە (ددانی پێشەوەی بێ باوەڕ -واتە کلبەی- بە وێنەی کێوی ئوحودە وە ئەستورایی پێستەکەشی سێ ڕۆژە ڕێیە) .

لەفەرمودەیەکدا هاتووە : **(ان الرجل من اهل النار ليعظم للنار ، حتى يكون الضرس من اضراسه كأحد)** [٤٢]. واتە (ئادەمیزاد لەدۆزەخدا بۆ ئاگر گەورە دەکرێت ، هەتا یەکێک لەخرێکانی دەبێتە ئەندازەی کێوی ئوحد) .

هەروەها هاتووە : **(ان غلظ جلد كافر اثنان واربعون ذراعا ، وان ضرسه مثل احد)** [٤٣]

واتە : (پێستی بێباوەڕ ئەندازەیی چل ودوو باڵ ئەستوور دەبێت ، وەخرێیەکیش دەبێتە ئەندازەی کێوی ئوحد....) .

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : **(ضرس الكافر يوم القيامة مثل احد ، وعرض جلده سبعون ذراعا ، وعضده مثل البيضاء ، وفخذه مثل ورقان ومقعده من النار مابيني وبين الربذة)** [٤٤]

واتە : (لەقیامەتدا خرێی بێباوەڕ وەک ئوحدە ، وەئەستوری پێستەکەی حەفتا باڵە قۆڵی هێندەی شاخی (بيضاء)ە ، وەڕانیشی وەک (ورقان)ە ، وەجێی لەدۆزەخدا ئەندازەیی نێوان مز و ڕەبزەیە) .

دیارە هەتا جەستە و لاشە گەورە تر بێت ، زیاتر ئازار و ئەشکەنجە لە دۆزەخدا دەچێژێت.

---

(٤٠) رواه البخاري باب الرقائق و رواه مسلم في صفة الجنة (٤١) رواه مسلم في صفة الجنة والترمذى في صفة جهنم
(٤٢) (رواه احمد وهو مرفوع) (الجنة والنار ص/٨٥) (٤٣) (مشكاة المصابيح/٣/١٠٣ ، صحيح وسنده صحيح
(٤٤) (اخرجه الحاكم واحمد ، سلسلة الاحاديث الصحيحة /٣/٩٣)

هەروەها پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی :(شفاعتی اکثر من مضر وان من یعظم للنار حتی یکون احد زوایاها ) [٤٥] واتە:(هەندێ لەئوممە تەکەم بەشەفاعەتی من دەچنە بەهەشتەوە کەژمارەیان لەتیرەی (مضر) زۆرترە، وەهەندێ لەئوممەتەکەم دەچنە دۆزەخەوە تاکو ئەوەندەی گۆشەیەکی دۆزەخ گەورە دەکرێن ) .

خوای گەورەش دەفەرموێت: (یوم نقول لجهنم هل امتلأت وتقول هل من مزید) (ق/٢٨-٢٩) . واتە: (لەو رۆژەدا بەدۆزەخ دەڵێن ئایا پڕ بوویت ؟ ئەویش دەڵێت: ئایا زیاتر هەیە بیهێنن) . واتە دۆزەخ ئەوەندە فراوانە کەپڕبوونی بۆنی یە

## پانزە : ڕق و قینی وهاواری دۆزەخ

دۆزەخ لەدووری (٥٠٠) ساڵ هاوارو ڕقو قینی بەرزدەبێتەوە بۆبێ باوەڕان و شاڵاویان بۆدێنێت وەک خوای گەورە دەفەرموێت: (بل کذبوا بالساعة واعتدنا لِمَنْکذب بالساعة سعیرا ، اذا رأیتهم من مکان بعید سمعوا لها تغیظا وزفیرا . واذا القوا فیها مکانا ضیقا مقرنین دعوا هنالك ثبورا .لاتدعوا الیوم ثبورا واحدا و ادعوا ثبورا کثیرا) (الفرقان/١١-١٤) .

واتە: (بەڵکو ڕۆژی دوایی یان بەدرۆ زانیوە ، وەدۆزەخی داخراومان بۆئەوکەسە ئامادەکردووە کەڕۆژی دوایی بەدرۆ دەزانێت . کاتێ دۆزەخ لەجێگایەکی دوورەوە دۆزەخی یەکان دەبینێت گرییان لەئەڕەو هاوارو ناڵەناڵی دەبێت وەکاتێک فڕێ دەدرێنە شوێنێکی بەرتەسک و تەنگی ناودۆزەخەوە بەدەست و مل بەستراوی لەوێدا هاواری ماڵوێرانی دەکەن و فریشتەکان پێیان دەڵێن : یەک جار هاواری ماڵ وێرانی مەکەن بەڵکو زۆرجار هاوار بکەن) .

پێغەمبەریش ﷺ لەفەرمایشتێکدا دەفەرموێت : (من کذب علي متعمدا فالیتبوأ بین عیني جهنم مقعدا ، قیل یارسول الله (ﷺ) ولها عینان ؟ قال اما سمعتم الله عزوجل یقول: (اذا رأتهم من مکان بعید سمعوا لها تغیظا و زفیرا ) یخرج من عنق من النار ، له عینان تبصران ، ولسان ینطق فیقول : وکلت لکل من جعل مع الله الها آخر ، فهو ابصربه من الطیر بحب السمسم فلیلتقطه )

وفي روایة : (اني وکلت بثلاث : بکل جبار عنید ، ومن دعا مع الله الها آخر ، وبالمصورین) [٤٦]

---

(٤٥) رواه إبن ماجة في صفة النار –٤٣٢٣– و رواه الحاكم و صححه الشيخ الفاضل الألباني (حفظه الله)

(٤٦) قال ابو عيسى هذا الحديث حسن غريب صحيح

هەرکەس بەئەنقەست درۆ بەدەم منەوە بکات (واتە هەڵیبەستێت) باشوێنی خۆی لەنێوان هەردوو چاوی دۆزەخ خۆش بکات ، ووترا : ئەی پێغەمبەری خوا ئەویش دووچاوی هەیە؟ فەرمووی : ئەی گوێتان لێنەبووە کەخوای باڵادەست لەمانایدا دەفەرموێت: (کاتێک دۆزەخ لەجێگایەکی دوورەوە دۆزەخییەکان دەبینێت ، گڕی بیستی نەڕەو هاوارو ناڵەناڵی دەبن) . ملێ لەئاگر دەردەچێت کەدووچاوی هەیە پێیان دەبینێت و زمانی هەیە قسەی پێدەکات و دەڵێت : من کراومەتە بەرپرسیاری ئازاردانی ئەوانەی هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن ، وەلەباڵندە بۆ کونجی - کەدەیبینێ و لەزەوی هەڵیدەگرێتەوە- باشتریان دەبینێت) لەڕیوایەتێکدا دەڵێت : (من بەرپرسیاری ئازاردانی سێکۆمەڵم : هەموو ستەم کارێکی زۆرداری کەڵلە ڕەق ، دووەم : هەرکەس هاوەڵ بۆ خوا پەیدا بکات ، سێیەم : وێنەگران) .

## شانزە : ئێش و ژانی ئاگر دەگات بەدڵ

باسی ئەوەمان کرد کەبێباوەڕان لەدۆزەخدا زۆرگەورە دەبن ، بەلام ئەو ئاگرە هێندە بەتینە کەژان و ئازار دەگەیەنێت بەناخ و قوڵایی جەستەیان

هەروەک خوای گەورە ئاماژەی بۆدەکات و دەفەرموێت: (سأصليه سقر ، وماادراك ماسقر لاتبقي ولاتذر . لواحةٌللبشر) (المدثر/٢٦-٣٠)

واتە : (دەیخەمە ناو -سقر- کەدۆزەخە ، تۆ چوزانیت سەقەر چییە ؟ شوێنێکی وایە کەهیچ کەسێک نامێلێتەوە کەتێکی نەشکێنێت و لەخۆی نەگرێت ، پتر لەوەش پێستی مرۆڤ داخ دەکات و ڕەشی دەکاتەوە ) .

هەندێ لەزاناکانی پێشین (سلف) دەڵێن : (گۆشت و ئێسقان و مۆخ دەخوات و بەشێوەی خۆی نایهێڵێتەوە ) [٤٧]

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : (كلا لينبذن في الحطمة ، وماادراك ماالحطمة ، نار الله الموقدة التي تطلع على الافئدة) (الهمزة/٤-٧)

واتە (نەخێر فڕێ دەدرێتە ناو (الحطمة) وە ، تۆ چوزانیت (الحطمة) چییە ؟ ئاگرێکە لەلایەن خواوە هەڵگیرساوە ، ئەو ئاگرەی لەسەر دڵەکانەوە بڵێسە دەدات و هەڵدەستێت)

---

(٤٧) أنظر التخويف من النار لابن رجب ص١٤٦

(محمدی کوڕی کعبی قرظی) دەفەرمویت : (ئاگر هەتا دڵی دەیخوات و دەیسوتێنێ ، کاتێکیش دەگاتە دڵی سەرلەنوێ دروست دەکرێتەوە) .

(ثابت) ی کوڕی (البنانی) ش ئەم ئایەتەی خوێندەوە پاشان فەرمووی : (ئاگر هەتا دڵیان دەسوتێنێ کەئەوان زیندووشن ، زۆری بۆ هێناون و سزاکەی تەنگاوی کردوون ، پاشان دەستی کرد بەگریان) (**عن ثابت بن البناني انه قرأ هذه الآية ثم قال : ( تحرقهم النار الى الافئدة وهم احياء لقد بلغ منهم العذاب ، ثم يبكي )** [٤٨].

واتە : سابتی کوڕی بەنان (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کاتێ ئەم ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی : (ئاگر دەیان سوتێنێت هەتا دەگاتە دڵەکانیان -خواپەنامان بدات- لەکاتێکدا ئەوان هەر زیندوون ، بەڕاستی سزاو ئێش زۆری بۆ هێناون . پاشان ئەم پیاوچاکەدەستی کرد بەگریان .

## حەقدە : گریان و هاواری دۆزەخی یەکان

بێگومان ئەم هەموو جۆرە سزاو ئازارە بوسۆو سەختانە گریان و هاواری لێ پەیدا دەبێت و شین و واوەیلای لێدەکەوێتەوە ، چونکە لەئێسقان و مۆخ کاردەکات ، ئەوەتا دەبینن قورئانی پیرۆز بەووردی دەنگ و هاوارو سکاڵای دۆزەخی یەکانمان بۆ تۆماردەکات و دەفەرمویت : (**واذا القوا مكانا ضيقا مقرنين دعوا هنالك ثبورا**) (الفرقان/١٣) .

واتە : (کاتێ بەدەست و مل فڕێ دەدرێنەوە شوێنێکی تەنگەبەر لەدۆزەخدا ، هاواردەکەن لەو شوێنەدا ، هاواری ماڵ وێرانی و لەناوچوون) .

هەروەها دەفەرمویت : (**ان تقول نفس ياحسرتا على مافرطت في جنب الله وان كنت لمن الساخرين**) (الزمر/٥٦) واتە : (ئەوکە دەڵێت : ئای ماڵ وێران خۆم ، چۆن کەم تەرخەم بووم لەئاستی مافەکانی خوای گەورەداو لەدنیادا گاڵتەم بەئاین ودوارۆژ دەهات) .

<u>باوەڕداری خۆشەویست :</u> سەیرکە ئەم بێبڕوایە چۆن هاواری لێبەرز بووەتەوەو پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت ، نەک هەر پەنجەی بەڵکو ئەوەندە سەری لێدەشێوێت تاهەردوو دەستی خۆی دەکات بەدەمیدا

---

(٤٨) (التخويف من النار ن لابن رجب/١٤٦)

وەک خوای گەورە دەربارەی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (يوم يعض الظالم على يديه ، ويقول ياليتني اتخذت مع الرسول سبيلا) (الفرقان/٢٧) واتە (لەو ڕۆژەدا ستەم کار قەپ دەکات بەهەردوو دەستی‌داو دەڵێت خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەم بگرتایەبەر) .

## هەژدە : توندی سزاو بێزار بوونی دۆزەخی‌یەکان

خەڵکی ئەوەندە بێزارو ماندوون لەدۆزەخ ، ئامادەن هەموو شتێک بکەن بەقوربانی خۆیان بۆئەوەی لەدۆزەخ پێ‌ی ڕزگاربین و بێنەدەرە . تەنانەت یەک یەکی ئەو شتانە دەکەن بەقوربانی ڕزگاربوونیان کەلەدنیادا خۆی دەکرد بەقوربانیان و لەپێناویدا خۆیان بەکوشت دەدا ،

وەک خوای گەورە دەفەرمووێت : (يود المجرم لو يفتدي من عذاب يومئذ ببنيه وصاحبته واخيه وفصيلته التي تؤويه ، ومن في الارض جميعا ثم ينجيه...) (المعارج/١١) .

واتە (تاوانبار لەوڕۆژەدا پێ‌ی خۆشە کە کوڕەکەی وهاوسەرەکەی و براکەی‌و هۆزەکەی-کەلەدنیاداپشتیان دەگرت و ئەمیش ئامادەبووخۆی بکاتە قوربانیان - وەهەرچی خەڵکی سەرزەویش هەیە بیانکاتە قوربانی خۆی و لەئازارو ئەشکەنجەی ئاگری دۆزەخ ڕزگاری ببێت) ، بەڵام مەحاڵەبەوشێوەیەش ڕزگاری نابێت .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : (للذين استجابوا لربهم الحسنى والذين لم يستجيبوا له لو ان لهم مافي الارض جميعا ومثله معه لافتدوا به اولئك لهم سوء الحساب ومأواهم جهنم وبئس المهاد) (الرعد/١٨) .

واتە : (ئەوانەی وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاریان دایەوە سەرەنجام پاداشت و ئاکامیان چاکە وەئەوانەی بانگەوازی پەروەردگاریان وەڵام نەدایەوە ، ئەگەر ئەوەی لەزەویدایە بەئەندازەی ئەوەش و (زیاتریش) هی ئەوان بێت ، ، بۆ ڕزگاربوون لەعەزابی خواو هەمووی ببەن (بەڵام دیسان لێیان قبوڵناکرێت بۆ ئەوان حسابێکی توندو خراپ هەیە ، وەدۆزەخ جێگەیانە کەئەمەش خراپترین مەنزڵگایە )

خوای گەورە دەفەرمویت (إن الذين كفروا وماتوا وهم كفار فلن يقبل من احدهم ملء الارض ولو افتدى به اولئك لهم عذاب اليم وما لهم من ناصرين) (آل عمران/٩١)

واتە : (بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان نەهێناو مردن لەکاتێکدا کە بێبڕوا بوون واتە بەبێباوەڕی مردن ، بەهۆی ئەو مردنەیان بەبێباوەڕی ، هەرگیز وەرناگیرێت لەهیچ کامێکیان بڕی زەوی لەئاڵتوون کەبیکات بەخێرو سەدەقە لەجیهاندا بۆ ڕزگاربوونی لەڕۆژی دواییدا ، وەهیچ سوودی نابێت بۆئەو ڕۆژەی . چونکە هەرکردەوەیەکی چاک بڕوای لەگەڵ نەبێت لای خوای گەورە هیچ نرخێکی نییە . گەر ئەو ئەندازەیەشی هەبێت لەقیامەتداو بیکات بەفیدیەی خۆی و لەبریتی خۆی بیدات هەرلێی وەرناگیرێت و ڕزگاری ناکات ، ئەوانە سێ‌جۆر هەڕەشەیان بۆهەیە : پڕی زەوی ئاڵتونی لێوەرناگیرێت ، سزایەکی سەختی بەئازاریان بۆهەیە ، هیچ یارمەتیدانێکیان بۆنییە ) .

پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت: (ان الذين كفروا لو ان لهم مافي الارض جميعا ومثله معه ليفتدوا به من عذاب يوم القيامة ماتقبل منهم ولهم عذاب اليم) (المائدة/٣٦) .

واتە : (بەڕاستی ئەوانەی کەلەدنیادا بێبڕواو سەرکێشن هەرلەسەر ئەو بارە دەمرن ، ئەوانە لەڕۆژی دوایدا ، گەر هێنی ئەوان بێت هەرچی وا لەزەویدا بەتێکڕوا پێکەوە ، وێنەو ئەندازەی ئەوەشیان ببێت لەگەڵیدا ، گەر ئەوەی باس کرا هی ئەوان بێت ، بۆ ئەوەی فیداکاری پێبکەن و بیدەن لەباتی سزای ڕۆژی دوایدا لێیان وەرناگیرێت ، بۆیان هەیە سزایەکی ئێش و ئازاردەر کەگەیشتبێتە ئەو پەڕی ڕادە ) .

## نۆزدە : بێهیوایی‌و ئەمری و ئاخ هەڵکێشانی بێباوەڕان لەدۆزەخدا

خوای گەورە دەفەرمووێت : (ان المجرمين في عذاب جهنم خالدون ، لايفتر عنهم وهم فيه مبلسون وماظلمناهم ولكن هم الظالمون ، ونادوا يامالك ليقض علينا ربك قال انكم ماكثون)(الفرقان/٢٧) .

واتە : (بەڕاستی تاوانباران هەمیشە لەئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە ، و سزایان لەسەر کەم ناکرێتەوە ، بۆ خۆیان لەدۆزەخدا بێهیواونیازبڕاو دەبن ، ئێمەش ستەم مان لێنەکردوون بەڵکو خۆیان ستەم کاربوون ، و هاوەڵیان داناوە ، بانگ دەکەن ئەی مالیك کەلێپرسراوی دۆزەخە دەبا پەروەردگارتگیانمان بکێشێت و ڕزگارمان ببێت ، ئەویش دەفەرموێت : (ئێوە هەر تیایدا دەمێننەوە ) ئاشکرایە ئەم وەڵامە تەواو بێهیوایان دەکات و نائومێد دەبن لەوەی کەڕۆژێ لەڕۆژان بێنەدەرەوە لەو ڕۆژە ڕەشەی کەتێی‌کەوتوون

محمدی کوڕی کەعبی (قرظی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (ئەهلی ئاگر هاوار دەبەن بۆ خەزەنەکانی دۆزەخ

وەک خوای گەورە دەفەرموێت: (وقال الذين في النار لخزنة جهنم ادعوا ربكم يخفف عنا يوم من العذاب) (غافر/٤٩). واتە (ئەوانەی لەئاگردان بە (خزنە)ی دۆزەخ دەڵێن: داوا لەپەروەردگارتان بکەن تەنها ڕۆژێک سزامان لەسەر سوک بکات، وەڵامەکەیان ئەوەیە: (أولم تك تاتيكم رسلكم بالبينات قالوا: بلى، قالوا فادعوا وما دعاء الكافرين إلا في ضلال) (غافر/٥٠)

واتە (ئایا پێغەمبەرانی خۆتان بۆڕەوانە نەکراو نەهاتنە لاتان بەبەڵگەو ئایەتی ڕوون و ئاشکراوە؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەوانیش دەفەرموون: دەمەر هاوار بکەن، هاوارکردنی کافرانیش هەر بەرەو گومڕاییە).

جا دوای ئەوەی لە (خزنة)[49] بێهیوابوون هاواردەبەن بۆلای (مالك)[50] کەلەسەرویانەوە شوێنێکی هەیە لەدۆزەخدا و پردی تێدایە کەفریشتەی سزای بەسەردا تێدەپەڕێت، ئنجا بێباوەڕان دەڵێن: (يامالك ليقضي علينا ربك) و داوای مردن دەکەن، (مالك) بێدەنگ دەبێت و وەڵامیان ناداتەوە بۆ ماوەی هەشتا ساڵ -کەساڵێک (٣٦٠) ڕۆژە و مانگێک (٣٠) ڕۆژەو هەر ڕۆژێکی دۆزەخ وەک هەزار ساڵی ئێمە وایە- پاش هەشتا ساڵ وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: (انكم ماكثون) ئێوە هەر تێیدا دەمێننەوە).

لەڕیوایەتێکی تردا کە(ترمذي) لە (اعمش)ەوە گێڕاویەتەوە هاتووە: کەلەنێوان داواکردنی ئەهلی دۆزەخ و وەڵامدانەوەیدا هەزار ساڵ دەخایەنێت[51]

خوای گەورە فەرموویەتی: (وقالوا لو كنا نسمع او نعقل ماكنا في اصحاب السعير، فاعترفوا بذنبهم فسحقا لأصحاب السعير) (الملك/١٠-١١) واتە: (بێباوەڕان دەڵێن ئەگەر گوێمان دابانێ، یا عەقڵمان بخستبایەکار لەڕیزی دۆزەخیان نەدەبووین، جادانیان بەتاوانی خۆیان دانا، جادۆزەخیان لە ڕەحمەتی خودا دوور بن).

---

(٤٩) ئەو فریشتانەن کە سەرپەرشتیاری دۆزەخن.

(٥٠) ئەو فریشتەیەیە کە لێپرسراوی دۆزەخەو و بە فەرمانی خوا دەجوڵێتەوە

(٥١) تفسير القرطبي ج١٦ ص١١٧

وە خوای گەورە دەفەرمویت **(قالوا ربنا امتنا اثنتين وأحيتنا اثنتين فاعترفنا بذنوبنا فهل الى خروج من سبيل)** (غافر/١١)

واتە : (دەڵێن ئەی پەروەردگاری ئێمە دووجار ئێمەت مراندو ، دووجار ئێمەت زیندوو کردەوە ، جائێمە بەگوناهی خۆمان ئیعترافمان کرد ، جا ئایا ڕێگایەک بۆ دەرچوون -ڕزگاربوون- هەیە ؟) . داوایەکەیان بەرپەرچ دەدرێتەوە بەڕسوایی و لەئاستی ئاژەڵ دا ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێت .

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت : **(ربنا غلبت علينا شقوتنا وكنا قوما ضالين ، ربنا اخرجنا منها وان عدنا فانا ظالمون ، قال اخسئوا فيها ولاتكلمون)** (المؤمنون/١٠٨) .

واتە : (ئایا نیشانەکانی منتان بەسەردا نەخوێندرایەوە ، جانەوتان بەدرۆخستەوە ، دەڵێن : ئەی پەروەردگاری ئێمە : لەدۆزەخ بمان بەرە دەرێ جانەگەر جارێکی دیکە ، دووپاتمان کردەوە جابەڕاستی ستەم کارین (وەشیاوی سزاین)، خوای گەورە دەفەرمویت : -چفە- دوورکەونەوە لەدۆزەخدا بمێننەوە، وەلەگەڵ من قسەمەکەن -اخسئوا بۆدەرکردنی سەگە-) .

شایەنی سزاو تۆڵەی خودایی بوون ، ئەم بێباوەڕی و مل هوڕی و دوای ژیانی کەشخەیی و فیزل زلی دنیایی ، سەرەنجام تووشی ئەم جێیە سەختە بوون کەهیچ نزاو تکاو پاڕانەوەیەک وەرناگیرێت .

پەروەردگار دەفەرمویت : **(ولو ترى اذ المجرمون ناكسوا رُؤُوسهم عند ربهم ربنا ابصرنا وسمعنا فارجعنا نعمل صالحا انا موقنون ، ولو شئنا لأتينا كل نفس هداها ولكن حق القول مني لأملأن جهنم من الجنة والناس اجمعين فذوقوا بما نسيتم لقاء يومكم هذا انا نسيناكم وذُوقوا عذاب الخلد بما كنتم تعملون)** (السجدة/١٢-١٤)

واتە: (وەئەگەر بینیت تاوانباران کاتێ لەپێشگای پەروەردگارتان سەریان بەرداوەتەوە -شۆڕکردووە- (دەڵێن) ئەی پەروەردگاری ئێمە ، ئەوەی بەبەڵێنت دابوو دیمان و بیستمان ، جابمانگێڕەوە (دونیا) هەتا کردەوەی چاک ئەنجام بدەین ، بەڕاستی ئێمە بەڕۆژی قیامەت بڕوادارین . وەئەگەر بمان ویستبا (بەزۆر ڕێنموونی پێویستمان بەهەر مرۆڤێک ئەدا ، بەلام بەڵێنی من بەرهەقە -بڕیارم داوە- کەبەڕاستی لەجنۆکەو مرۆڤی بێبڕواو تاوانبار دۆزەخ پڕدەکەم بەئەندازەیەک هەر جمەی بێت جا بچێژن سزای (دۆزەخ) لەبەرئەوەی دیداری ئەم ڕۆژەتان

لەبیرخۆ بردبۆوە ، بەڕاستی ئێمەش ئێوەمان لەبیرخۆ بردەوەو ، سزای بەردەوام بچێژن لە (پاداشتی ) ئەوەی ئەنجامتان ئەدا )

دۆزەخی یەکان هەموو داواو نزایەکیان ڕەفزکرایەوە ، بەهیچ چلۆنێک قووتار بوونیان بۆنی یە وەک چۆن نەسزایان لەسەر هێواش دەکرێتەوەو نەدەمرن بەڵکو سزای هەمیشەیی و بەردەوام و هەتاهەتایی یان بۆ هەیە

لەو ساتەدا پێیان دەوترێت : (اصلوها فاصبروا او لاتصبروا سواء عليكم انما تجزون ماكنتم تعملون) (طور/١٦) . واتە: (بچنە ئێوی و بسوتێن جانارام بگرن یان ئارام نەگرن بۆ ئێوە جیاوازی نی یە ، تەنها سزای کردەوە بەدەکانتان دەدرێتەوە ) .

ئەو کاتە هاوارو واوەیلایان بەهێز تر دەبێت و لافاوی فرمێسک هەڵدەستێت و وەگریانیان بەردەوام دەبێت ،

خوای گەورە دەفەرموێت: (فليضحكوا قليلا وليبكوا كثيرا جزاء بما كنتم تكسبون) (التوبة/٨٢) واتە (جابائەوان کەم پێ بکەنن و زۆر بگرین سزایەکە بۆئەو کارانەی ئەنجامیان داوە ) .

## بیست : ووتاری شەیتان بۆ دۆزەخی یەکان

سەرسوڕهێنەرترین باری دۆزەخی یەکان بریتی یە لەووتاردانی شەیتان بۆیان ، کەئەم ووتارە زۆر کاردەکاتە سەر دەروونی بیسەری ووتارەکە . مینبەرێک لەناو دۆزەخدا بۆشەیتان دروست دەکرێت و ووتارێکیان بۆ دەدات کەمەینەت و پەژارەیان زیاد دەکات زایتر خەم دەروونیان دادەگرێت و ئازار لەسەر ئازار توندتر دەبێت چونکە ئەم ووتارە دەبێتە هۆی پەشیمانی دۆزەخی یەکان و ئاخ هەڵکێشانیان ، کەچۆن بەنەفامی شوێن فێلباز و ساختەچی ئاواکەوتین و ئەمڕۆ ئەمیش ئەمە ئەمەکووەفایەتی ، جاقورئانی پیرۆزیش ئەم ووتارەی بۆ تۆمارکردووین

وەک خوای گەورە دەفەرموێت : (وقال الشيطان لما قضي الامر : ان الله وعدكم وعد الحق وَوَعدتكم فأخلفتكم ، وماكان لي عليكم من سلطان الا ان دعوتكم فاستجبتم لي فلا تلوموني ولوموا انفسكم ، ما انا بمصرخكم وما انتم بمصرخي ، إني كفرت بما أشركتمون من قبل إن الظالمين لهم عذاب أليم) (ابراهيم/٢٢)

واتە : (کاتێک کاروباری ڕۆژی لێپرسینەوە یەکلا کرایەوە -کۆمەڵی بەهەشتی چوونە بەهەشتەوە و کۆمەڵی دۆزەخی چوونە دۆزەخەوە- شەیتان دەڵێت : خوای گەورە پەیمانی خۆی دانێ پەیمانێکی ڕاست و دروست -کەزیندووبونەوەیە بۆ لێپرسینەوەو دادگایی و دیاری کردنی پاداشت و سزا ، لەبەرامبەر کردەوەی چاکدا کردەوەی چاک و لەبەرامبەر کردەوەی خراپیش سزای گونجاو- وەمنیش پەیمانم پێدان بەڵام ئەم بردەسەر -واتە درەۆم لەگەڵدا کردن کەووتم ئەم شتانە نی‌یە- وەمن هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو بەسەرتانا تەنها ئەوەندە نەبێت بانگم کردن ئێوەش بەدەنگمەوە هاتن- جاکەوابوو لۆمەی من مەکەن و لۆمەی خۆتان بکەن ، نەمن ئەتوانم ئێوە ڕزگار بکەم- واتە شەیتان خۆی داوای ڕزگار بوون دەکات- بەڕاستی من کافرم بەهەموو ئەو شێوانەی کەمنتان تێدا دەکرد بەهاوبەشی خوای گەورە لەپێشدا ، ستەمکارانیش سزای بەئازارو سەختی خوایان پێ‌دەبڕێت ) [٥٢]

## بیست و یەک: ئاوی ڕووباری (الغوطة)

(الغوطة) ئاوێکی بۆگەنە لەداوێنی ئافرەتی داوێن پیسەوە دەردەچێت . وەک پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) هەواڵمان پێ‌دەدات و دەفەرموێت (**نهر يجري من فروج المومسات ، يؤذي اهل النار ريح فروجهم**) [٥٣]

واتە : (ڕووبارێکە لەداوێنی ئافرەتی داوێن پیسەوە سەرچاوەدەگرێت ، بۆنی داوێنیان ئازاری دۆزەخی‌یەکان دەدات) .

## بیست و دوو: دۆزەخی‌یەکان و پەرستراوەکانیان پێکەوە فڕێ دەدرێنە دەرەوە

بێگومان -لەم ژیانەدا- سەرەڕای ناردنی پێغەمبەران (ﷺ) و ڕەوانەکردنی بەرنامەی ژیان لەلایەن خواوە و سەرەڕای دەرکەوتنی نیشانەو بەڵگەکانی دەسەڵاتی بێ‌سنووری پەروەردگار ، هێشتا کەسانێک هەن کەدڵەکانیان ژەنگی بێ‌باوەڕی خواردوویەتی ، هەندێکیان هێندە بێ‌هێشکن هەست بەبوونی خوایەکی خاوەن دەسەڵات و کاربەجێ‌ناکەن بۆ ئەم بوونەوەرەو پێیان وایە

(٥٢) أنظر (زبدة التفسير من فتح القدير) .

(٥٣) رواه أحمد ج٤ ص٣٩٩

کەدونیا بەهەموو زەبەللاحی‌و فراوانی‌یەوە بەڕێکەوت هەرلەخۆیەوە پەیدابووە و هەندیکی تریان لەناخەوەهەست بەبوونی دروست کەریک دەکەن و مەبەستیشیان ئەوەیە کەئەو دروست کارە بدۆزنەوەو بەندایەتی بۆبکەن

ئنجا ئەم کەسانەش دەبن بەدوودەستەوە : هەندیکیان یەکێک لەدروست کراوەکانی خوا وەک: (ڕۆژ - گا - ئاگر - هتد) دەپەرستن و ڕاستەو خۆ بەخوایان دادەنێن . هەندیکی تریشیان باوەڕیان بەبوونی‌خوا هەیە و ئەگەر پرسیاریان لیٚبکریت لەبارەی دروست بوونی بوونەوەرو خاوەنی ئەم گەردوونەوە لەوەلامدا دەلین (خوا دروست کارو مشور خۆریەتی) . بەلام لەبەندایەتی کردنیدا سەریان لیٚشیواوەو بەپیٚی داواو مەبەستی پەروەردگار پەرستن و بەندایەتی بەجیٚنامینن ، بەلکو یەکێک لەشتەکانی بەردەستی خۆیان دەپەرستن کەدروست کراوی دەستی خۆیانە ، بەمەبەستی نزیک بوونەوە لەخواوەو دەیانکەن بەهۆکار (وسیلة) یەک بۆ گەیشتن بەخواو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا ؛ بەلام ئەم بۆچونانەی باسمان کرد گشتیان هاوەڵ دانانە بۆ خواو لەویستی خواوە دوورە . بۆیە خوای گەورەش هەڕەشەی توند لەوجۆرەکەسانە دەکات پیٚیان ڕادەگەیەنیت کەخۆیان و ئەوانەش کەدەیپەرستن و بەگەورەیان دەزانن و بەرگریان لیٚدەکەن و پارەو سامان گیانی خۆیان لەپێناودا دەبەخشن پێکەوە سوتەمەنی دۆزەخن تابزانن کەپەرستراوەکانیان چەندە بیٚ ڕێزن ، هیچیان لەدەست نایەت و تەنانەت بەرگریشیان لەخۆیان پیٚناکریت ، وەدلنیابن کەچەندەگومڕاو سەرلیٚشیواون .

وەک خوای گەورە دەفەرمویت : **(انكم وماتعبدون من دون الله حصب جهنم انتم لها واردون لوكان هؤلاء ماوردوها وكل فيها خالدون)** (الانبياء/۹۸-۹۹) .

واتە : (دلنیابن کەئیوەش و ئەوانەش کەبیجگە لەخوا دەیانپەرستن دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ و هەمورتان دەچنە ناویەوە ، ئەگەر ئەو پەرستراوانەی ئیوە خوابوونایە نەدەچوونە دۆزەخەوە ، کەچی هەموویان بەهەمیشەیی تیایدا دەمیننەوە) [٥٤]

---

(٥٤) بیگومان پەرستراوەکانی وەک عیسا پیغەمبەر (درورد و سلاوی خوای لەسەر بیت) کە گاورەکان بە کوڕی خوای دەزانن یان وەک عوزەیر پیغەمبەر (درورد و سلاوی خوای لەسەر بیت) کە جولەکەکان بە کوڕی خوای دەزانن ئەمانە و هی تریش ناخرینە دۆزەخەوە چونکە خۆیان لە لوتکەی بەندایەتی‌دا بوون و ڕازیش نەبوون کە خەلکی لە دوای خۆیان هەلسن بە پەرستنیان

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت : (احشروا الذين ظلموا هم وازواجهم وماكانوا يعبدون من دون الله فاهدوهم الى صراط الجحيم ، وقفوهم انهم مسؤلون مالكم لاتناصرون بل هم اليوم مستسلمون) (الصافات/٢١-٢٦) .

واتە : کۆیان بکەنەوە ئەوانەی کەشەریکیان بۆخوا داناوە وەهاوڕێنەشیان ئەوانەی کەکردبوویان بەهاوەڵی خواو ئەیانپەرستن لەباتی خوا ، ڕێنمویان بکەن بۆسەر ڕێگەی دۆزەخ ، بیانسوتێنن ئائەوانە لێپرسینەوەی توند و تیژیان لەگەڵدا دەکرێت ، خوای گەورە دەفەرمویت ئەوە چیتانە بۆ وا داماو و بێدەسەلاتن بۆ سەرناکەون ، بەڵێ ئەوان ئەمڕۆ (ڕۆژی دوایی) بێدەسەلات و تەسلیم بوون) .

جابۆ چاوشکاندن و سەرزەنشت کردن و بێڕێزکردنی ڕۆژ و مانگ پەرستەکان ، لەڕۆژی دواییدا ڕۆژو مانگ کۆدەکرێنەوەو فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە ، وەک پێغەمبەریش (درودو سلاوی خوای لێ بێت) دەفەرمویت : (الشمس والقمر مكوران في النار) (٥٥)

واتە : (ڕۆژو مانگ کۆدەکرێنەوە لەناوئاگردا) . هەندێ لەزانایان دەفەرموون : (کۆکردنەوەی ڕۆژو مانگ و خستنیانە ئاگری دۆزەخەوە تەنها بۆ شکاندنی هاوەڵ پەیدا کەرانە ، چونکە ئەوانە بێگیانن و هەست بەسزا ناکەن) (٥٦)

## بیست و سێ : دەرچوونی ڕیخۆڵەی دۆزەخیەکان

لە (ئوسامەی کوڕی زەیدەوە) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لەپێغەمبەری خواوە (درودو سلاوی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی : ( **يجاء بالرجل يوم القيامة فيلقى في النار ، فتندلق اقطابه في النار فيطحن فيها كطحن الحمار برجاء ، فيجتمع اهل النار عليه ، فيقولون : اى فلان ماشانك؟ اليس كنت تامرنا بالمعروف وتنهانا عن المنكر ؟ قال : آمركم بالمعروف ولاآتيه ، وانهاكم عن المنكر وآتيه ، ثم هو يدور ويسعى حولها كما يدور الحمار برحاء** ) (٥٧)

واتە : (لەڕۆژی دواییدا پیاوێک دێنن وەفڕێی دەدەنە ناوئاگرەوە جاڕیخۆڵەکانی دەکەوێتە ناوئاگرەکەوە و ژێڕپێی دەکەون ، ئنجا وەک گوێدرێژ (یاخود وەک گای گێرە) بەدەوری خۆیدا

(٥٥) سلسلة الأحاديث الصحيحة ٩٨-٩٩

(٥٦) رياض الصالحين ج١ ص٢٢٦ مترجم

(٥٧) رواه مسلم ج١٧ ص١٣٦ و إبن ماجة ج١ ص٤٣

دەخولێتەوەو ڕیخۆڵەکانی گێرە دەکات، دۆزەخی یەکان لێی کۆدەبنەوەو پێی دەڵێن ئەی فلانە کەس! ئەوە تۆچی دەکەیت لێرەو بۆچی وات لێ قەوماوە ؟ ئەی تۆنەبوویت کەفەرمانت پێدەکردین کەچاکە بکەین ڕێگری (نهی) یت لێدەکردین کەخراپەبکەین ؟ ئەویش لەوەلامدا دەڵێت: باوابووم بەلام فەرمانم پێدەکردن بەچاکەو خۆم نەم دەکرد، وەڕێگریم دەکردن بەخراپەو خۆم دەمکرد، پاشان وەک کای گێرە بەدەوری ڕیخۆڵەکانیدا دەخولێتەوەو تەکان دەدات).

ئەوانەی کەلەدۆزەخدان کەبەڕیخۆڵە ڕادەکێشرێن (عەمری کوڕی لوحی) کەیەکەم کەس بوو ئاینی عەرەبی گۆڕی بۆ بت پەرستی وەک لەم فەرمودەیەدا هاتووە: (**عن جابر بن عبدالله، قال: قال رسول الله (ﷺ): (رأيت عمرو بن عامر الخزاعي يجر قصبه في النار، وكان اول من ساب السوائب)** [٥٨]

واتە (عەمری کوڕی عامری خوزاعیم بینی کەبەڕیخۆڵەکانی بەناو دۆزەخدا ڕادەکێشرا یەکەم کەسیش بوو یاسای -سوائب- دانا).

ئەم یاسایە بریتی بوو لە حەلاڵکردنی شتی خودا کەحەرامی کردووە، وەحەرام کردنی شتی خودا کەحەلالی کردووە کەئەمیش جۆرە ئاژەڵێک -حوشترێک- حەرامی کردبووە لەسەر خەڵکی سواربوونی و گۆشت خواردنی

## بیست و چوار: هەندێک لەشێوەکانی سزای دۆزەخ

لەئەنەسی کوڕی مالکەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە: (کە پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (لەقیامەتدا دۆزەخی یەک دێنن کەخۆشترین ژیانی دنیایی بووە، ئەوجا یەکجار دەکرێت بەدۆزەخدا پاشان پێی دەوترێت: (لەدنیادا هیچ خێرو خۆشی یەکت دیوە؟ دەڵێ: نەبەخوا!!).

هەروەها پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لێ بیت) باسی سوکترین سزای دۆزەخ دەکات و دەفەرموێت (ان اهون اهل النار عذابا رجل اخمص قدميه جمرتان يغلي منهما دماغه) [٥٩]

واتە: (ئاسانترین دۆزەخی کەسزای سووک بێت پیاوێکە دوو پشکۆ لەژێر هەردوو پێیدا دادەنرێت، و مێشکی دێنێتە کوڵ)

---

(٥٨) (رواه مسلم)

(٥٩) رواه البخاري ج١١ ص٤١٧ و مسلم ج٣ ص٨٥

پێشەوا ( حسن بصري) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەتەفسیری ئەو ئایەتەدا کەخوای گەورە دەفەرمویت (كلما نضجت جلودهم بدلناهم جلودا غيرها ليذوقوا العذاب) (النساء/٥٦)

واتە : (هەرکاتێک پێستەکەیان هەڵقرچا ، بۆیان دەگۆڕین بەپێستی تر بۆ ئەوەی بەردەوام ئازار بچێژن) . چونکە پێستی لاشە هەرکاتێک سەرلەنوێ دروست بووەوە ناسکتر دەبێتەوەو ئازاری بەسوێ ترە وەک لەجاری یەکەم

ئنجا هەموو ئێش و ئازاری لاشەش لەپێستدایە ، بەزۆری هەستە دەمارەکان لەپێستدا کۆدەبنەوە -وەک زانستی نوێ سەلماندویەتی . کەواتە دۆزەخی یەکان بەپێی تاوانیان سزایان جیاوازە لەیەکتری .

## بیست و پێنج: ئایا هەموو چاکەکارێك وبەدکارێك بەدۆزەخدا دەبرێن ؟

ئەمە جێی مشت و مڕی هەندێ لەزانایان بووە هەر لەکۆنەوە وەک دیارە خراپەکار وئیمانداریش بەدۆزەخدا دەبرێن ، بەڵام دۆزەخ باوەڕداران ناسوتێنێت

وەک لەم فەرمودەیەدا هاتووە : (**حدثنا احمد قال: حدثنا سليمان بن حرب قال : حدثنا غالب سليمان عن كثير بن زياد البرساني عن سمية قال : اختلف في الورود ، فقال بعضنا لايدخلوها قوم وقال بعضنا يدخلونها جميعا ثم ينجي الله الذين اتقوا فلقيت جابر بن عبدالله فقلت له : انا اختلفنا في الورود فاهوى اصبعيه في اذنيه وقال: صمتا ان لم اكن سمعت رسول الله ( ﷺ ) يقول: ( الورود الدخول لايبقى بر ولافاجر الا دخلها فتكون على المؤمنين بردا وسلاما كما كانت على ابراهيم حتى ان للنار او لجهنم ضجيجا من بردهم ثم ينجي الله الذين اتقوا ويذر الظالمين فيها جثيا** ) [٦٠]

واتە (ئێمە جیاوازیمان تێکەوت لەبارەی بران بەناو دۆزەخدا ، هەندێکمان وتی : هەندێکی پیادەچن ، وەهەندێکی ترمان وتی : هەموو بەناو دۆزەخدا دەبرێن ، پاشان خوای گەورە خواناسەکان -خۆپارێزەکان- لێی ڕزگاردەکات ، ئنجا گەیشتم بەجابری کوڕی عبدالله و پێم ووت ئێمە ڕای جیاوازمان لەبارەی بردن بەناو دۆزەخدا هەیە ، ئەویش پەنجەی برد بۆناو کونچکەکانی و فەرمووی: بێدەنگ دەبووم ، ئەگەر لە پێغەمبەرم (درودو سڵاوی خوای لێ بێت)

(٦٠) (مسند احمد /٣٠٠-٣٢٨) (انظر كتاب الحدائق في علم الحديث والزهد لابن الجوزی ص/٥٥٤)

نەبیستایە کەفەرموویەتی : (هەموو چاکەکار و بەد کاریک بەدۆزەخدا دەبرینریت ، بەلام ئاگر سەلامەت و سارد دەبیت بۆ بڕواداران ، وەک چۆن سەلامەتوسارد بوو بۆ إبراهیم پیغەمبەر (سەر سلاوی خوای لی بیت )) -هەتا ئاگری دۆزەخ دەنگی ساردی لیوەدیت پاشان خوای بالادەست خۆپاریزەران ڕزگار دەکات و ، ستەم کاران بەسەر شۆڕی تیایدا دەهیلیتەوە )

## بیست و شەش : سزا دەروونی یەکانی دۆزەخ

سەرەڕای سزای جۆر بەجۆری بەرجەستەو لاشەیی ، جۆرەها سزای دەروونیش بەدۆزەخی یەکان دەبریت یەکیک لەو سزایانە بریتی یە لەشکاندن وسەرزەنشت و گالتەپیکردنی فریشتەکان پی یان .

وەک خوای گەورە دەفەرمویت : (كلما القي فيها فوج سألهم خزنتها الم يأتكم نذير ، قالوا بلى قدجائنا نذير فكذبنا وقلنا مانزل الله من شيء ان انتم الا في ضلال كبير ، وقالوا لو كنا نسمع او نعقل ماكنا في اصحاب السعير فاعترفوا بذنبهم فسحقا لأصحاب السعير)(الملك/ ٨-٩-١٠-١١)

واتە : (هەر جاریک هەرکۆمەلیک لەو بی باوەڕانە فڕی دەدریتە ناو دۆزەخەوە پرسیاریان لی دەکریت لەلایەن دەرگاوانی دۆزەخەوە : ئایا ترسینەریکتان بۆنەهات لەخۆتان ووتیان : بەلی هات بۆلامان ترسینەر بەلام بەدرۆمان زانیو وەووتمان : داینەبەزاندووە خوای گەورە هیچ شتیک بی گومان ئیوە لەگومڕای یەکی زۆر گەورەدان، وەوتیان ئەگەر گویمان بگرتایەو عاقل بوینایە ئیمە لەهاوڕی یانی دۆزەخ نەدەبووین ، ئیعترافیان کرد بەتاوەنەکانیان بۆ هاوڕی یانی دۆزەخ ) .

یەکیکی تر لەو سزادەروونی یانە ئەوەیە کەخۆیان لەناو یەکتردا نەفرەت لەیەکتردەکەن لەم بارەشەوە خوای گەورە دەفەرمویت : (كلما دخلت امة لعنت اختها) (الاعراف/٣٨) .

واتە : (هەر کاتیک تاقمیک دیتەناو دۆزەخەوە نەفرەت لەتاقمەکەی تر دەکات)

هەروەها دۆزەخی یەکان کاتی دەبینن ئەو باوەڕدارانەی کەئەمان لەدنیادا گالتەیان پی دەکردن ، وا لەقیامەتدا ڕزگاریان بووەلەئاگری دۆزەخ و سەرکەوتوون خۆشبەختیان بەدەست هیناوە لەلایەن خوای پەروەرگاریانەوە وەک دەفەرمویت : (وقالوا مالنا مانرى رجالا كنا نعدهم من الاشرار اتخذناهم سخريا) (ص/٦٢-٦٣) .

سزایەکی دەروونی تر ئەوەیە کەقسەکردنیان لێقەدەغە دەکرێت ، دۆزەخی یەکان پێنج داواکاریان لەخواهەیە ، سەبارەت بەچواریان وەلامیان دەداتەوە : لەپێنجەمیاندا لەقسەدەکەون . بەکەم جار دەڵێن : **(قالوا ربنا امتنا اثنتين واحييتنا اثنتين فاعترفنا بذنوبنا فهل الى الخروج من سبيل)** (غافر/١١) .

واتە (دەڵێن ئەی پەروەردگارمان دووجارت مراندووین و دووجارت زیندوو کردوینەتەوە ، ئەوا ئێمە دانمان نا بەتاوانەکانماندا باشە ئیتر هیچ دەروویەک هەیە بۆ دەربازبوون؟ خوای گەورە وەلامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: **(ذلكم بانه اذا دعى الله وحده كفرتم وان يشرك به تؤمنوا...)** (غافر/١٢) .واتە: (ئەوە ئێوەبوون ئەگەر بانگەواز بکرایە بۆ تەنهایی خوا بێ باوەڕ دەبوون وەئەگەر هاوبەشی بۆ دانرایە ئابەو جۆرە باوەڕتان دەهێنا ) .

ئنجا دەڵێن : **(ربنا ابصرنا وسمعنا فارجعنا نعمل صالحا)** (السجدة/١٢) .واتە : (ئەی پەروەردگارمان بینیمان بیستمان -ڕاستی ڕۆژی پاداشت و سزا - ئیتر بمانگێرەوە باکردەوەی چاك بکەین ) ،

خوای گەورە لەوەلامیاندا دەفەرموێت : **(او لم تكونوا أقسمتم من قبل مالكم من زوال)** (ابراهيم/٤٤) . واتە : (ئایا پێشتر سوێندتان نەدەخوارد کەنەمانتان بەسەر نایەت)

پاشان دەڵێن : **(ربنا اخرجنا نعمل صالحا غير الذي كنا نعمل)** (فاطر/٣٧) . واتە : (ئەی پەروەردگارمان لەدۆزەخ دەرمان بهێنە باکردەوەی چاك بکەین جگەلەو کردەوانەی دەمان کرد ) .

خوای گەورە لەوەلامیاندا دەفەرموێت: **(اولم نعمركم مايتذكر فيه من تذكر وجاءكم النذير ، فذُوقوا فما للظالمين مِن نَصير)** واتە : (ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێنەدابوون تائەو کەسەی دەیەوێت بیربکاتەوە بیری بکردایەتەوە ، وەئاگادارکەرەوە -پێغەمبەرانتان- بۆمات دەبیچێژن سزاوئازار ، ستەمکارانیش هیچ پشتیوانی یەکیان نی یە ) .

لەدواجاردا دەڵێن: **(قالوا ربنا غلبت علينا شقوتنا وكنا قوما ضالين ، ربنا اخرجنا منها فان عدنا فانا ظالمون)** (المؤمنون/١٠٦-١٠٧) . واتە (دەڵێن ئەی پەروەردگارمان مەینەتیمان بەسەردا زاڵ بووە گەیشتۆتە تینمان وەئێمە گەلێکی گومرابووین ، پەروەردگارمان ئەگەر ئێمە گەڕاینەوە ئەوا ئێمە ستەمکارین )

لە دوای ئەم ئایەتە خوای گەورە دەم کوتیان دەکات و دەفەرمویت : (أخسؤا فیها ولا تکلمون) واتە : (بەدەردی خۆتانەوە بتلێنەوە لەدۆزەخداو هیچ قسەش مەکەن) . لەدوای ئەوە ئیتر هیچ قسەناکەن کەئەوەش ئەو پەڕی سزایە

(عبدالله) کوڕی (عومەر) (ڕەزای خوایان لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (لەڕۆژی قیامەتدا مردن دەهێنرێت لەسەر شێوەی بەرانێکی ڕەش وسپیدا ، سەردەبڕێت لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا ئنجا بەئەهلی بەهەشت دەوترێت: بەنەمری بمیننەوە لەبەهەشتا بەبێ‌مردن ، وەبەئەهلی ئاگر واتە -دۆزەخی‌یەکان- دەوترێت: بەنەمری بمیننەوە لەئاگردا بەبێ مردن .

**عن ابي سعيد (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) : (اذا دخل اهل الجنة الجنة ، واهل النار النار يجاء بالموت كانه كبش املح فيوقف بين الجنة والنار فيقال يااهل الجنة : هل تعرفون هذا ؟ قال: فيشرئبون فينظرون ويقولون نعم هذا الموت ، قال : فيقال : يااهل النار هل تعرفون هذا ؟ قال : فيشرئبون فينظرون ، ويقولون: نعم هذا الموت قال: فيؤمر به فيذبح ، قال : ويقال : يااهل الجنة خلود بلاموت وياهل النار خلود بلا موت ...الحديث)** (٦١)

واتە : (کاتێ ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشت وەدۆزەخی‌یەکان دەچنە دۆزەخەوە ، مردن لەوێنەی بەرانێکی ڕەش و سپیدا دەهێنرێت وەلەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا دادەنرێت ، وەدەوترێت : ئەی بەهەشتی‌یەکان دەزانن ئەمە چی‌یە ؟ دەفەرمویت : سەیردەکەن و دەڵێن : ئەوە مردنە ، پاشان دەوترێت : ئەی دۆزەخی‌یەکان دەزانن ئەوە چی‌یە ؟ دەفەرمویت : ئەوان سەیردەکەن و دەڵێن : بەڵێ ئەوە مردنە . فەرمووی : فەرمانی بۆ دەردەکرێت سەردەبڕێت ، فەرمووی : وەدەوترێت : ئەی بەهەشتی‌یەکان نەمرن و تیایدا نامرن ، وەئەی دۆزەخی‌یەکان بەنەمری تیایدا دەمیننەوە بەبێ‌مردن ....فەرموودەکە) .

ئەمە بەگشتی سەبارەت بەجۆرەکانی سزای دۆزەخ ، بەڵام گەورەترین ناخۆشی و سزای دەروونی کەتووشیان دەبێت لەکیس چوونی خۆشی وبەهرە (نعمة) کانی بەهەشتە ،

---

(٦١) (اخرجه البخاري عن عمر بن حفص بن غياث عن ابيه ، اخرجه مسلم عن ابي كريب عن ابي معاوية ، كلاهما عن الاعمش /٤/٢١٨٨) (أنظر كتاب الحدائق في علم الحديث والزهديات لإبن الجوزي حققه وعلق عليه مصطفى السبكي ص/٥٧١) .

هەروەها لەکیس چوونی ڕەزامەندی خوای گەورەیە ، وەکاتێک دەزانن ئەم دووشتە گرانبەهایەیان بەنرخێکی هەرزان فرۆشتووە لەدەروونیخۆیاندا دەڵێن : (ئای چۆن مالی خۆمان ویران کرد ! ! ) چۆن بێئارام بووین لەسەر ژیانی کەمی دونیاو ئەم دنیا نەبڕاوەیەمان لەدەست دەرچوو ! ! بەڵام : نەخێر ... هەرگیز پەشیمانی دادی کەس نادات و ناسۆریو سزادەروونی یەکان کەم ناکاتەوە

خوێنەری موسوڵمان : بزانە خوای گەورە دۆزەخ و سزای دروست کردووە کۆمەڵێکی بۆ دروست کردووە کەئەهلی دۆزەخ بن ، وەئەم کۆمەڵەش ژمارەیان کەم وزیاد ناکات

وەک خوای گەورە دەفەرموێت : **(وانذرهم يوم الحسرة اذ قضي الامر و هم في غفلة وهم لايؤمنون)** (مريم/٣٩) واتە (ئاگاداریان کەرەوە لەڕۆژێک کەپەشیمانی تیادا دەردەبڕن کاتێک کەفەرمانی بەندەکان تیایدا یەکلا دەکرێتەوە -بەهەشتی بۆبەهەشت و دۆزەخی بۆ دۆزەخ- وەئەوان لەبێئاگایی‌دان و باوەڕ ناهێنن) .

جابەڕاستی ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە کەئێمە بەردەوام پێ‌دەکەنین و وەسەرقاڵ دەبین بەشتی کەم بایەخەوە ! ! لەگەڵ ئەوەدا کەنازانین ئایا سەرەنجاممان بەچی دەگات ؟! وەبەچی تەمەنمان کۆتایی دێت و لەپێناوی چیدا بەختی دەکەین ؟! دەبا چاو بخشێنینەوە بەکارەکانماندا و هەوڵی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە بدەین و دڵمان بدەینەوە بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە کەدەفەرموێت: **(ان الابرار لفي نعيم وان الفجار لفي جحيم)** (الانفطار/١٣-١٤) .

واتە : (بەڕاستی‌ئەوانەی چاکەکارن لەناز و نیعمەتدان لەبەهەشتدا و ئەوانەش کەخراپەکارن لەدۆزەخدان ) . بۆئەوەی پشتیوان بەخوا لەدۆزەخی پڕمەینەتی خوا ڕزگارمان بێت .

یەکێکی تر لەسزا دەروونی‌یەکانی ناو دۆزەخ ئەوەیە کەدۆزەخی‌یەکان جێگای خۆیانیان پێ‌نیشان دەدەرێت کەلەبەهەشتدا بۆیان دانرابوو ، ئەگەر گومڕا نەبوونایە .

هەروەک پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : **(ولايدخل النار احدا الا أرى مقعده من الجنة لو احسن ليكون عليهم حسرة)** [٦٢] واتە : (هیچ کەسێک ناچێتە ئاگرەوە تائەو جێگایەی پێ‌نیشان دەدرێت کەلەبەهەشتدا بۆی دانرابوو ، ئەگەر لەژیانی دنیادا چاکەی بکردایە ، بۆئەوەی ببێتە مایەی پەژارەو پەشیمانی کەبەو شێوەیە سەرپێی و سادەیی‌یە لەدەستی خۆی داوە ) .

---

(٦٢) رواه البخاري

خوێنەری بڕواداری هۆشیار : ئەکەی کاتی پڕفەڕو بەرەکەتت لەکیس بدەیت و خەریکی گوناه وتاوان بیت لەهەموو ئەو سزادەرونی‌و لاشەیی‌یانەی کەباس کراوە لەم ناملیلکەدا ناخۆشترو سەخت تر ئەوەیە ، کەئەم ئادەمیزادە بێباوەڕانە بێبەش دەبن لەبینینی خوای گەورەی بالادەست و میهرەبانی خاوەن زەوی و ئاسمان تۆ بڵێی چی لەوە ناخۆشتر بیت کەهەتا لەقیامەتیش بەهرەمەند نەبیت لەبینینی پەروەردگاری دروست کارت ! ئەکەی ئەی نەفسە سەرکەشەکەم ... ئەکەی ببیتە درک وبچیتە نێوان من و پەروەردگارم ، من لەپێش دروست بوونی ئادەمەوە ئیعترافم بەبوونی دروست کارم کردووە ! دەبا بۆ ساتێکیش بێت چاوەکانم لەخۆشی بینینی ( ذوالجلال والاکرام ) بێبەش نەبێت .

## بیست و حەوت: ئەو تاوانە هەرە گەورانەی کەدەبنە هۆی مانەوەی هەمیشەیی لەدۆزەخدا

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی ئەو گوناهەگەورانەی کردووە کەدەبنە هۆی چوونە دۆزەخەوە بەهەمیشەیی وەلێرەدا ئاماژە بۆهەندیکیان دەکەین لەوانە :-

### ١) بێباوەڕی و هاوەڵ دانان بۆ خوا

خوای گەورە دەفەرمویت: **(الذین کذبوا بالکتاب وبما ارسلنا به رسلنا فسوف یعلمون ، اذ الاغلال في اعناقهم والسلاسل یسحبون في الحمیم ثم في النار یسجرون . ثم قیل لهم این ماکنتم تشرکون . من دون الله ؟ قالوا ضلوا عنا ، بل لم تکن ندعوه من قبل شیئا ، کذلك یضل الله الکافرین ، ذلکم بما کنتم تفرحون في الارض بغیر الحق ، وبما کنتم تمرحون)** (غافر/٧٠-٧٥) . واتە : (ئەوانەی قورئان وئەو کتێبانەی کەپێغەمبەرانمان بۆ ڕەوانەکردن بەدرۆدەزانی ، ئەوانە لەداهاتوودا دەزانن کەسەرەنجام کردەوە خراپەکانیان بەرەو سەرەنجامێکیان بردوون کاتێک دەبینن کۆت لەگەردنیاندایەو زنجیری درێژ لەدەست و پێیاندایەو بەناو ئاوی کوڵاودا ڕادەکێشرین ، پاشان لەئاگردا دەکرینە سووتماک وەئاگریان پێ خۆش دەکرێت ، پاشان پێیان دەگوترێت : ئەوانە لەکوێن کەبەهاوەڵتان دادەنا بێجگە لەخوا ؟ دەڵێن : لێمان وون بوون ڕۆیشتن ، خۆ ئێمە لەپێشدا لەهیچ نەپاڕاینەوەو نەمان دەپەرست -پاش ئەوەی بۆیان ڕوون بووەوە کەچەند گومڕاو نەزان بوون کاتێک ئەوان بێجگەلە خوایان دەپەرست کەنەدەبینن و

نەدەبیستن و نەسوود و قازانجیان هەیە ئەو کاتە هەست بەپەشیمانی دەکەن و نکۆڵی لەپەرستراوەکانیان دەکەن جابەو جۆرە خوا بێباوەڕەکان گومڕا دەکات ئەوەش بەهۆی ئەوەیە کەلەسەر زەویدا بەبێباوەڕییەکەتان کەیف و خۆش و دڵخۆش بوون ، بەناهەقی و بێئەوەی مافی ئەو سەرپێچی کردنەتان هەبێت وەبەهۆی ئەو دەعیەو فیزو دەمارەوەیە کەدەتان نواند ) .

## ٢) بە درۆزانینی ڕۆژی دوایی

کاتێک بەهەشتییەکان لەبێباوەڕەکان دەپرسن بۆچی ئێوە لەدۆزەخی (سقر) دان ؟ بێباوەڕان وەلامیان ئەوەیە کەدەڵێن : **(لم نكن من المصلين ، ولم نك نطعم المسكين ، وكنا نخوض مع الخائضين ، وكنا نكذب بيوم الدين)** (المدثر/٤٣-٤٧) .

واتە : (ئێمە لە نوێژ خوێنان نەبووین ، وەخواردنی هەژاریشمان نەدەدا ، وەلەگەڵ بۆچووان لەناڕەزووی دنیادا ڕۆدەچووین ، وەڕۆژی دوایشمان بەدرۆ دەزانی ) .

## ٣) گوێڕایەڵی سەرکردە بێبڕواکان

خوای گەورە دەفەرموێت: **(قالوا ربنا انا أطعنا سادتنا وكبرائنا فأضلونا السبيلا)** (الاحزاب/٦٧) . واتە : (دەڵێن ئەی پەروەردگارمان بەگوێی سەرکردەو گەورەکانی خۆمان کرد ، ئەوانیش ڕێگەی ڕاستیان لێوون کردین ) دەبا ژێر دەستەی هەموو کۆمەڵێ لەم ئایەتە وردبنەوەو پەند وەربگرن ، کورد واتەنی بەچەپڵەی هەموو کەس هەڵنەپەڕین ) .

## ٤) دوو ڕوویی

خوای گەورە دەفەرموێت : **(ان المنافقين في الدرك الاسفل من النار)** (النساء/١٤٥) .

واتە : (بەڕاستی دوو ڕووەکان لەتەختی بنەوەی ئاگردان ) . بزانە ئەی خوێنەری ئازیز : ئەم کۆمەڵە لەبێباوەڕان مەترسیان زیاترە بۆبڕواداران وەمێژووی پرشنگداری ئیسلامیش شایەتە لەسەر ئەمە

## ٥) خۆبەزل زانین

لەفەرموودەیەکدا هاتووە کەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (يدخلني الجبارون المتكبرون) [٦٣]
واتە ( زۆرداران و خۆبەزل زانان دێنە ناومەوە )

(٦٣) رواه مسلم ج٤/٢١٨٦

خوای گەورە دەفەرمویت: (ویل لكل أفاك أثيم . يسمع آيات الله تتلى عليه ثم يصر مستكبرا كأن لم يسمعها فبشره بعذاب اليم ، واذا علم في آياتنا شيئا اتخذها هزوا اولئك لهم عذاب مهين من ورائهم جهنم ولايغني عنهم ماكسبوا شيئا ولا ما اتخذوا من دون الله أولياء ولهم عذاب عظيم) . (الجاثية /٧-٨-٩-١٠)

واتە: رر

## بیست و هەشت : هۆی چی‌یە دۆزەخی‌یەکان زۆرن

هۆی زۆری دۆزەخی‌یەکان ناگەڕێتەوە بۆ نەگەیشتنی بانگەوازو ڕەوانەکردنی پێغەمبەران و بوون نەبوونی ئاین لەلای خەلکی ، چونکەهەرکۆمەلێکنێراویان بۆ ڕەوانە نەکرێت لەلایەنخواوە ڕاستی‌یان پێ‌نەگات خوای گەورە سزایان نادات ،

وەک خوای‌گەورە دەفەرمویت : (وماكنا معذبين حتى نبعث رسولا) (الاسراء/١٠) واتە (ئیمە سزای هیچ گەل و نەتەوەیەک نادەین هەتا نێراوی بۆ ڕەوانە نەکەین) لەبەر ئەوە خوای گەورە نێراوی بۆ هەرگەل و نەتەوەیەک ڕەوانە کردووە وەک دەفەرمویت : (وان من امة الا خلا فيها نذير) (فاطر/٣٤) واتە : (هیچ ئومەتێک نی‌یە کەئاگادارکەرەوەیەکی تێدا ڕەوانە نەکرابێت) .

(ابن رجب) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمویت: هۆی زۆری دۆزەخی‌یەکان ئەمانەن :-

١- شوێن نەکەوتنی پێغەمبەران (ﷺ) .

٢- شوێن کەوتنی ئاینێک کەلەلایەن خواوە هەلوەشاوەتەوە (واتە: منسوخ )ەو کاری پێ‌ناکرێت وەک ئاینی مەسیحی‌و جولەکە

٣- یان هەندیکی تریان شوێنی ئاینی ڕاست دەکەون بەلام دوو ڕوون بۆیە دەچنە پلەی هەرە خوارەوەی دۆزەخ

٤- یان هەندیکیان تووشی داهینان ( بدعـة ) دەبن وەک لەفەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کەئەم ئوممەتە دەبێتە ( ٧٣ ) بەش کەهەموویان لەئاگردان بێجگـە لەیەک کۆمەڵ . کەدەچێتە بەهەشتەوە [٦٤]

٥- ڕەنگە هۆی سـەرەکی چوونـە نـاو دۆزەخ هــەواو ئارەزووەکـان بێـت ، کەهــەندێ لەخـەڵکی دەیانەوێت بەڕێگەی نادروست بگەن بەتێرکردنی ئارەزووەکانیان و ڕەچاوی شەرعی خوا ناکەن .

پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لەفەرموودەیەکیدا دەفـەرموێت : **(لما خلق الله النـار قـال لجبريل : اذهب فانظر اليها ، فذهب فنظر اليها ، ثم جاء فقال : وعزتك لايسمع بها احد فيدخلها . فحفها بالشهوات فقال : اذهب فانظر اليها ، فذهب فنظر اليها ، فلما رجع قـال: وعزتـك قد خشيت ان لايبقى احد الا دخلها)**[٦٥]

واتە: (کاتێک خوا ئاگری دروست کرد بـەجبریلی فـەرموو : بـڕۆ سـەیری بکـە ، ئـەویش ڕۆیشت و سەیری کرد ، پاشان فەرمووی: سوێند بەشکۆ(عزة) ی تۆ هیـچ کـەس دەربـارەی نابیستێ‌و بچێتـە ناوی . ئینجا خوای گەورە دەوری بەئارەزووەکان گرت و فەرمووی بڕۆ سـەیری دۆزەخ بکـەرەوە ، ڕۆیشت سەیری کردو گەڕایەوە فەرمووی : سوێند بەشکۆی تۆ ئەترسم هیچ کەس نەمێنێت ، هەموو بچێتە دۆزەخەوە )

٦- هۆی چوونە ناو دۆزەخ شوێن کەوتنی کوێرانەی باوباپیرانە پابەند بوونە بەدابو نەریتی خراپی کۆمەڵگاوە کەزۆر لەمیللەتانی پێشوو تووشی ئەم نەخۆشی‌یە بوون .

## بیست و نۆ : سزای شەیتان لەدۆزەخدا

وەک ڕوون‌وئاشکرایە سەرسەخت ترین دوژمنی مرۆڤ شەیتان بـووە کەهـەر لەکۆنـەوە دژایـەتی هەموو نەوەی ئادەمی کردووە ، وەزۆرینەی لەخشتە بردووە و توشی ئەشکەنجەو ئازاری دۆزەخی کردووە ، بۆیە بەباشمان زانی باس لەسزای ئەم دوژمنە سەرسەختە بکەین لەدۆزەخدا .

---

(٦٤) أنظر التخويف من النار ص٢١٤

(٦٥) رواه الترمذي و أبو داود

لەکتێبی (کتاب الحدائق ص٥٥٨) دا هاتووە حدثنا حسن قال : حدثنا حماد بن سلمة عن علي بن ابي زيد عن انس بن مالك قال : قال رسول الله (ﷺ) : (أول من يكسى حلة ابليس وهو يسحبها من خلفه وذريته من خلفه وهو يقول : ياثبوراه وهم ينادون حتى يقف على النار فيقول : ياثبوره . فينادون ياثبورهم وهو يقول : (لاتدعوا اليوم ثبورا واحدا وادعوا ثبورا كثيرا) [٦٦]

واتە : (یەکەم کەسێ کە پۆشاکی ئاگری دەکرێتە بەر شەیتانە ، ئەخرێتە سەر بزی لەدواوە ڕادەکێشرێت وەنەوەکانیشی بەدوای دا ، ئەویش دەڵێ : ئەی ماڵ ویرانی ، وەئەوانیش هاواردەکەن و دەڵێن ماڵویرانی بۆمان هەتا لای ئاگر ڕادەوەستێ و دەڵێت:هاوار وماڵ ویرانی بۆ من وە ئەوانیش هاوار دەکەن هەتا لای دۆزەخ ڕادەوەستێت و دەڵێت: ماڵ ویران و هاوار بۆ من ، ئەوانیش بانگی لێ دەکەن و دەڵێن ماڵ ویرانی بۆمان ، لە کاتێکدا ئەو دەڵێت : ئەمڕۆ یەک جار داوای لە ناو چوون و ماڵویرانی مەکەن بەڵکو داوای ماڵ ویرانی گەورە و زۆر بکەن)

## سێ : زۆربەی دۆزەخییەکان کێن

ئافرەتان بەڕێژەی زیاتر لەپیاوان دەخرێنە دۆزەخەوەو سزا دەدرێن وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (رأيت النار ورأيت اكثر اهلها النساء) [٦٧]

واتە : (ئاگرم بینی و وەبینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتن)

زۆری ڕێژەی ئافرەتانیش لەدۆزەخدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانە :-

١- حەزو ئارەزوو زۆرتر زاڵە بەسەریاندا و زوو دەخەڵەتێن بەجوانی و خۆشی دنیا

٢- زۆرتر چاو دەبڕنە دنیاو خۆیان بەجوانی ڕازاوەو خۆدەرخراوی ئامادەدەکەن و ڕۆژی دواییان لەیاد دەچێت و خۆیانی بۆ ئامادەناکەن .

٣- بەهۆی خۆڕازاندنەوەو دەرخستنی جوانی لەشیان دەبنە گەورەترین هۆکار بۆ لادانی پیاوان لەبیرکردنەوە لەقیامەت و سەرنج ڕاکێشانیان بۆلای خۆیان

٤- زۆرتر بەدەم بانگەوازی شەیتان و بێباوەڕان و فێڵبازانەوە دەچن و فریو دەخۆن .

٥- لەبەرئەوەی دڵیان بەجوانیو خۆشی دنیا ، کەمتر بەدەم بانگەوازی خواییەوە دەڕۆن .[٦٨]

(٦٦) (مسند احمد/٣/ ١٥٣) (٦٧) رواه البخاري ومسلم (٦٨) التذكرة للقرطبي ج١ ص٣٦٩

# سی و یەك: چۆن خۆت لەدۆزەخ دەپارێزیت ؟

لەبەرئەوەی بێباوەڕی هۆی تووش بوونی بەندەیە بەسزای دۆزەخ مانەوەی لەناو ئاگری بەژان و ئازاری بەسۆداو لەڕەزامەندی خوای بێبەش دەکات . کەوابوو دەبێت بەرامبەر بەو بێباوەڕییەش هۆکارو ڕێبازی سەرفرازی هەبێت بۆڕزگار بوون لەو ئاستەنگە تاڵەو گەیشتن بەئامانجی هەرەمەزنی دوایێئو پایەی بەرز و خۆشەویستی پەروەرگارو مانەوەی هەمیشەیی لەبەهەشتدا ، وەك :-

باوەڕهێنان و کردەوەی چاکی بەردەوام هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت :

(ان الذين امنوا وعملوا الصالحات كانت لهم جنات الفردوس نزلا) (الكهف/١٠٧) .

واتە : (بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناو کردەوە چاکەکانیان کردووە ، ئەوانە فیردەوسی بەرین جێگایانەو میوانداریان دەکات)

## ١-خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو موسوڵمانانی یەکتاپەرست

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (اوثق عرى الايمان الحب في الله والبغض في الله )[٦٩]

واتە (قایمترین ڕشتەی بڕوا (ئیمان) بریتییە لەخۆشەویستی لەبەر خوا ، وەڕق بوونەوە لەبەر خوا ) هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (والله لايلقى الله حبيبه في النار)[٧٠] .

واتە : (سوێند بەخوا : خوا خۆشەویستی خۆی فڕێ ناداتە ناو ئاگرەوە ) .

## ٢- بە ڕۆژوو بوون

جگەلەوەی ئەرکێکی پێویستە گرتنی لەکاتی خۆیدا کەمانگی ڕەمەزانەو هەردەبێ بەجێ بهێنرێت هەروەها خواو پێغەمبەر (ﷺ) زۆر داکۆکی لەسەر دەکەن و دڵنیامان دەکەنەوە کەڕۆژوو (فەرز) بێت یان سوننەت ، دەبێتە هۆی ڕزگاربوون لە دۆزەخ وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (الصوم جنة من النار)[٧١]

واتە : (ڕۆژوو پارێزەرەو قەڵغانە لەئاگر) .

---

(٦٩) حسنه الشيخ الفاضل محمد ناصر الدين الألباني (حفظه الله)

(٧٠) أنظر صحيح الجامع ج٦ص١٠٤ (٧١) رواه أحمد و النسائي و إبن ماجة

## ٣- فرمێسک ڕشتن (گریان) لە ترسی خواو (جیهاد) کردن لە پێناوی خوادا

باوەڕدار لەدۆزەخ دەپارێزێن:وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (**لایلج النار من بکی من خشیة لله حتی یعوداللبن فی الضرع ،ولا یجتمع علی عبدغبارفی سبیل الله ودخان جهنم**) (٧٢)

واتە:(ناچێتە ئاگرەوە کەسێک لەترسی خوابگری تاشیر نەگەڕێتەوە بۆ ناگوان ،وەتەپ وتۆزی لەڕێی خوادابێت ودوکەڵی دۆزەخ پێکەوە لەسەریەندەیەک کۆنابنەوە).

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (**لا یجتمع کافر وقاتله فی النار**) (٧٣) واتە (بێباوەڕو ئەوەیکوشتوویەتی پێکەوە ناخرێنە دۆزەخەوە).

## ٤- پە ناگرتن بە خوا لە ئاگری دۆزەخ وزۆر پاڕاندنەوە بۆچە پانە دان لێی

وەک خوای گەورەدەفەرموێت (....**ربنا اصرف عنا عذاب جهنم**) (الفرقان/٦٤) ...واتە(ئەی پەروەردگارمان سزای دۆزەخمان لێ لا دەیت ).

هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت ( ....**ولا استجار رجل مسلم الله من النار ثلاثا : الا قالت النار اللهم أجره مني**) (٧٤)...واتە (هەرکەسێکیموسولمان سێ جار پەنابگرێت بەخوا لەئاگری دۆزەخ ئەوائاگریش دەڵێت خوایەگیان :پەنای بدە لێم و بیپارێزە).

هەروەها (عبدالله) ی کوڕی (عباس) (ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرمویەتی (**کان النبی (ﷺ) یعلمهم هذا الدعاء کما یعلمهم السورة من القرآن ، قولوا : اللهم إنی أعوذ بك من عذاب جهنم ،و أعوذ بك من عذاب القبر وأعوذ بك من فتنة المسیح الدجال واعوذ بك من المحیا و الممات**)(٧٥)

واتە: (پێغەمبەر ﷺ فێری ئەم نزایەی دەکردین وەک چۆن فێری سوورەتێکی قورئانی دەکردین ، دەی فەرموو : بڵێن : خوایە پەنات پێ دەگرم لە سزای دۆزەخ و پەنات پێ دەگرم لە سزای گۆڕو پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی مەسیحی فێڵ باز و پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی ژیان و مردن)

---

(٧٢) رواه الترمذی و النسائی

(٧٣) رواه مسلم

(٧٤) أنظر صحیح الجامع ج٢ ص٢٣٣

(٧٥) رواه مسلم و الترمذی و النسائی و أبو داود و مالك

# سی و دوو: وتوێژی دۆزەخی یەکان

دۆزەخی یەکان ئارامیان لێ هەڵگیراوەو بێ هیوان لەوەی جارێکی تر ڕزگاریان بێت ، بۆیە ئەم جارە دەکەونە سەرزەنشت و گازندەی یەکتری و دەبێتە دەمەقاڵەیان لەدۆزەخدا

ئەوەتا خودا ئەم شەڕو بەگژداچوونەیان مان بۆباس دەکات و وەدەفەرموێت: (هذا وان للطاغين لشر مآب جهنم يصلونها فبئس المهاد هذا فليذوقوه حميم وغساق وآخر من شكله أزواج . هذا فوج مقتحم معكم لامرحبا بهم انهم صالوا النار . قالوا بل انتم لامرحبا بكم انتم قدمتوه لنا فبئس القرار . قالوا ربنا من قدم لنا هذا فزده عذابا ضعفا في النار وقالوا مالنا لانرى رجالا كنا نعدهم من الاشرار ، اتخذناهم سخريا أم زاغت عنهم عنهم الابصار ان ذلك لحق تخاصم اهل النار) (سورة ص/٥٥-٦٤) .

واتە (دۆزەخ کە (بۆ سوتاندن) دەچنە نێوی جا چ جێگایەکی بەد فەرە ! ئەمە خواردنەوەیەکی داغ و سوتینەرو چڵکنی بۆگەنە جائەبێ بیچێژن و بیخۆنەوە . وەبێجگەلەمە لەهەموو جۆرە ئەشکەنجەیەکی‌کەیان بۆهەیە بەوان دەوترێت : ئەمە دەستەیەکە لەگەڵ ئێوەدەخرێنە دۆزەخ بەخێرنەیەن ، بەڕاستی ئەوان (بۆسوتاندن) دەکەونە دۆزەخ ئەوان بەسەرکردەکانی خۆیان دەڵێن :

بەڵکو ئێوە لەخۆشی‌دا نەبن و بەخێرنەیەن : ئێوە ئەم سزایەتان بۆ ئێمە سازدا جا چ جێگای مانەوەیەکی خراپە . (لەپاشان دەڵێن) ئەی پەروەرگارمان ! هەرکەس ئەم دەردەی توش کردین ، ئازارو سزای دوچاری بدە . وەدەڵێن بۆچی پیاوانێ لەخراپەکارانمان دەژماردن ، ئێستا نایانبینین گاڵتەمان پێ‌دەکردن (ئێستا لەبەهەشتان) یان زۆر بێ ڕێزن لەناوئاگرن نایان بینین) .

بەلام لەبارەی : (هذا فوج مقتحم لامرحبا بهم انهم صالوا النار) ئەمە لێرەدا باس لەدەمەقاڵێی نێو دۆزەخی‌یەکان دەکات وەک چۆن لەسورەتێکی تردا هاتووە : (كلما دخلت امة لعنت اختها) (الأعراف/٣٨)

واتە: (هەرکاتێک کۆمەڵێک لەدۆزەخی‌یەکان دەچنە دۆزەخەوە نەفرین دەکەن لەوانەی پێش خۆیان) واتە لەجیاتی سلاو و ڕێز نەفرین لەیەکتری دەکەن و یەکتری بەدرۆزن دەزانن ، بۆیە

کاتێک کۆمەڵی یەکەم دەخرێنە دۆزەخ کۆمەڵێکی تر بەدوایاندا دێن کۆمەڵی یەکەم دەڵێن : ئەوا کۆمەڵێکی تر هاتن لەگەڵ ئێوەی لێپرسراوی دۆزەخ ، بەخێرنەیەن وئەوا دەچنە ناگرەوە وەکۆمەڵی یەکەم دەڵێن : بەڵکو ئێوە سڵاوتان لێنەبێت و بەخێرنەیەن ئێوە ئێمەتان گومراکردوو واتان لێکردین ئەم چارەنووسەمان هەبێت کەناخۆشترین و خراپترین مەنزڵگایە . بۆیە دەڵێن کێئێمەی والێکرد ئەم چارەنووسەی تووش کردین ئەوا سزای چەند جارەیان بدە ) .

ئەم ووتوێژە لە جێگایەکی تریشدا هاتووە: (قالت أوخراهم لأولاهم ربنا هؤلاء اضلونا فآتهم عذابا ضعفا من النار، قال لكل ضعف ولكن لاتعلمون) (الأعراف/٣٨)

واتە (کۆمەڵی دوایی بەکۆمەڵی یەکەم دەڵێن پەروەردگار ئانەمانە ئێمەیان گومراکرد سزایان بۆ چەند جارە بکەرەوە خوای گەورە دەفەرموێت : (بۆهەر یەکەتان سزا چەندین دەکرێت وەئێوە نازانن) .

کەواتە لێرەدا خوای گەورە ئەوەندەی تر نائومێد بارگران تریان دەکات بەوەی کەسزاکەیان بۆچەندین دەکات خوا پەنامان بدات . لەلایەکی ترەوە خوای گەورە دیمەنێکی تریان دێنێتە پێش چاو : (بێباوەڕان وایان زانیوە لەدونیادا کەموسوڵمانان گومڕان و ئێستاش دەڵێن : ئەرێ کۆمەڵێ هەبوو ئێمە بەخراپمان زانین ئێستا لێرە نایان بینین !) .

ئیمامی موجاهید (ﷺ) فەرمویەتی ئەم قسەیە هی ئەبوجەهلە کەدەڵێ: ئەرێ من بیلال و عەممارو سوهەیب و خەباب ...هتد لەم دۆزەخەدا نابینم ، ئنجا دەڵێن ئێمە لەدونیادا گاڵتەمان پێدەکردن خۆیان دڵنەوایی خۆیان دەدەنەوەو دەڵێن : لەوانەیە لەدۆزەخدا بن بەڵام ئێمە نایان بینین [٧٦]

## سی و سێ: سێبەری دۆزەخ

تینی ئاگری دۆزەخ لە توانای خۆراگری نارامگرتنی مرۆڤدا نی یە بەڵام دەشێت خوای گەورە لەرۆژەدا مرۆڤ بەشێوەیەک دروست بکاتەوە کەشیاوی ئەو سزا پڕ ئێش و سەختە بێت هەر تەنها ئاوی کوڵاو وگەرمی زۆر نی یەو بەس هەروەها بوونی سێبەری دووکەڵی ڕەش گەرمی بۆن ناخۆشیش یەکێکە لەو جۆرە سزانارەحەتانەی کەدۆزەخی یەکان هەمیشە پێوەی دەناڵێنن .

(٧٦) (تفسير ابن كثير، ص ٣٩-٤٠ ج٤)

وەک خوای گەورە دەفەرمویت: (**واصحاب الشمال ما اصحاب الشمال في سموم وحميم وظل من يحموم لابارد ولاكريم ، انهم كانوا قبل ذلك مترفين**) (الواقعة ٤١-٤٥) .

واتە : (هاوەڵانی لای دەستی چەپ دەبیت بەختیان چۆن بیت وە هاوەڵانی دەستی چەپ دەبیت بەختیان چۆن بیت ، لە نێوبلێسەی ئاگر و ئاوی کوڵیو دان وە لە ژێر سیبەری ڕەشی دوکەڵی داخدان ، سیبەریکە نە فینکە وە نە بەکەڵکە ، ئەمانە بەر لەمە -لەدونیادا- لە نازو نیعمەتیکی زۆردا بون)

(عبدالله) ی کوڕی (عباس) (ڕەزای خوایان لێ بیت) دەفەرمویت ئەو (**ظل من يحموم**)

واتە (دوکەڵ) وە ئەمەش ڕای موجاهیدو قەتادەیە ئەمەش وەک ئەم ئایەتەیە (**إنطلقوا إلى ما كنتم به تكذبون، إنطلقوا إلى ظل ذي ثلاث شعب لا ظليل ولا يغني من اللهب إنها ترمي بشرر كالقصر كأنه جمالة صفر ويل يومئذ للمكذبين**) (المرسلات/٣٠-٣١-٣٢-٣٣-٣٤)

واتە : (بکەونە ڕێ بۆلای ئەوەی بە درۆتان دەزانی بۆلای سیبەری دوکەڵی سێ شاخ بچن ، سیبەریکی فینک کەرەوەو نە لە گڕی ئاگر بەرگری دەکات ، ئاگریکی وەها کە پریشکی وەک کۆشک و -کێو- فڕێ دەدات لە توند ڕۆیشتندا)

وەک حوشتری زەردن لەو ڕۆژەدا بۆ بە درۆ خەرەوان هەیە کەواتە : دوکەڵی ڕەشی ناشیرینی بۆن ناخۆش .[٧٧]

---

(٧٧) (أنظر ابن كثير ج٤ ص٢٥٨)

## سی و چوار: برژاندنی پێستی لەشیان

خوای گەورە سزای توند و هەموو جۆرێکی بۆ بێ باوەڕان ئامادە کردووە وە بە شێوازی سامناک ئاماژەیان بۆ دەکات ، وەک دەفەرموێت : (إن الذين كفروا بآياتنا سوف نصليهم نارا كلما نضجت جلودهم بدلناهم جلودا غيرها ليذوق العذاب) (النساء/٥٥)

واتە : (ئەوانە بێ باوەڕن بە نیشانەکانی ئێمە بە زوویی دەیان کێشینە ناو ئاگر ، کە هەر کاتێک پێستی لەشیان ببرژێت -بسوتێت- پێستی تریان بەسەردا دەکێشینەوە ، وە تاو دەدرێ تا سزا بچێژن) وەک پێشتر باس کرا پێستی بێ باوەڕان زۆر ئەستوور دەبێت بۆ ئەوەی بەردەوام لە سزا و ئازاردا بن ، هەرکاتێ ئەم پێستانە ببنە خەڵوز و ڕەش هەڵبگەڕێن بە خێرایی دەیگۆڕین بۆ ئەوەی ئازار بچێژن ، بێ باوەڕان هەمیشە لە زەلیلی وسزای پڕ ئێشتی دۆزەخدا دەبن شێوەیەک هیچ ئەندامێکی لاشەیان نامێنێت ئاگر نەیسوتێنێت ، ئەوەتا هەتا ئاگر دەم و چاویشیان دەگرێتەوە )

خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموێت: (و من خفت موازينه فأولئك الذين خسروا أنفسهم في جهنم خالدون تلفح وجوههم النار و هم فيها كالحون) (المؤمن/١٠٣-١٠٤)

واتە : (ئەوانەی تەرازووی کردەوەیان سوک بێت جا ئەوانە کەسانێکن کە زیانیان لە خۆیان داوە وە لە دۆزەخیشدا بەهەتا هەتایی دەمیننەوە ئاگر ناو چاویان دەگرێت و لە دۆزەخدا وە پێ گرژ و مۆن و پێستی دەم و چاویان هەڵدەقرچێنێت ) .

## سی و پێنج : جنۆکەی کافر دەچێتە دۆزەخەوە

وەک چۆن بێ باوەڕانی ئادەمی دەچنە دۆزەخ ، بەهەمان شێوە بێ باوەڕانی جنۆکە دەچنە ناوی . وەک خودای گەورە دەفەرموێت : ( وما خلقت الجن و الانس إلا ليعبدون )(الذاريات/٥٦)

واتە : ( ئێمە جنۆکە و مرۆڤمان دروست نەکردووە مەگەر بۆخوا پەرستن )

خوای گەورە جنۆکەو ئادەمیزادی بۆپەرستن دروست کردووە لەقیامەت دا جنۆکەو ئادەمیزاد کۆدەکرێنەوە

وەک پەروەردگار دەفەرموێت: (ویوم یحشرهم جمیعا یامعشرالجن قد استکثرتم من الانس) (الأنعام/١٢٨) واتە (ئەو ڕۆژەی کەهەمویان کۆدە کا تەوە و حەشریان دەکات پێ یان دەڵێت ئەی تاقمی جنۆکە ئێوە زۆرتان لە مرۆڤ گومرا کرد )

پەروەخوای گەورە دەفەرموێ (فو ربك لنحشرنهم والشیاطین ثم لنحضرنهم حول جهنم جثیا ثم لننزعن من کل شیعة ایهم أشد علی الرحمن عتیا .ثم لنحن أعلم بالذین هم أولی بها صلیا ) (مریم/٦٨) واتە: سوێند بەپەروەردگارتان .هەموو ئەوانە لەگەڵ شەیتانەکان حەشر دە کرێن ئەوسا هەموو یان بەدەوری جەهەننەمدا لەحاڵێک دا بەچۆک داهاتون ئامادە دەکرێن . لەپاشان هەردەستەیێ لەبەرامبەر خوای گەورە یاخی بوبێ جیادەکرێتەوە پاشان (بزانە ) ئەوکەسانەی بۆسوتاندن شیاون بەچاکی ئاگادارو زانان پەوان .

پاشان بەبێباوەڕانی جنۆکە دەوترێ (ادخلوا في امم قد خلت من قبلکم من الجن والانس في النار) (الأعراف/٣٨) واتە: (خوا فەرموێ: لەگەڵ هاوبیرانی خۆتان لەمرۆڤ و جنۆکە بڕۆنە ناوئاگر) .

## سی و شەش: ڕەش هەڵگەڕانی دەم و چاو

یەکێکی تر لەنیشانەکانی و سەر شۆڕی دۆزەخی یەکان لەو ڕۆژەدا ڕوو ڕەش بوون و ڕسوابوونی بەردەرگای خوای گەورەیە لەبەردەم هەموو بەشەریەتدا ئابڕوویان دەبرێت . وەک پەروەردگاری مەزن ئەم دیمەنە پڕ ترس و بیمە دەخاتە بەرچاو و دەفەرموێت: (یوم تبیض وجوه وتسود وجوه ، فأما الذین اسودّت وجوههم أكفرتم بعد إیمانکم فذوقوا العذاب بما کنتم تکفرون) (آل عمران /١٠٦)

واتە : (ڕۆژێکە هەندێ ڕوویان سپی و هەندێ ڕوویان ڕەش هەڵدەگەڕێ ، بەڵام ئەوانەی وا ڕوویان ڕەش هەڵگەڕاوە (پێیان دەوترێت ) ئایا دوای بڕوامێنان کافر بوونەوە ؟ )

جا ئێستا زەرد دەچێژن لەپاداشتی ئەوەی کافر بوونەوە واتە هێندە ڕووڕەش دەبن وەک ئەوەی کەتاریکی شەو لەڕوویاندا بێت

وەک خوای گەورە دەفەرمویت (والذين كسبوا السيئات جزاء بمثلها وترهقهم ذلة مالهم من الله من عاصم كأنما أُغشيت وجوههم قطعا من الليل مظلما اولئك اصحاب النار هم فيها خالدون) (يونس/٢٧)

واتە : (ئەوانەی خراپەیان کردووە سزای تاوانیان بەو ئەندازەیەوە پەستی دایان دەگریٚ و دایان دەپۆشیٚ و هیچ شتێک ناتوانێت ئەوانە لەسزادانی خوا بپارێزێت . دەڵیی دەم وچاویان بەبرکە گەلێک (بەشێک) لەشەودا داپۆشراوە ئەوانە ئەهلی ئاگرن و بۆ هەمیشە لەناو ئاگردا بەهەمیشەیی دەمیننەوە )

## سی و حەوت: ئاگر ئابلوقەی بیٚباوەڕان دەدات

دۆزەخی‌یەکان ئەو بیٚباوەڕانە دەگریتەوە کەلەدنیادا دژایەتی ئاینی پەروەرگاریان کردووە و بوونەتە درک ودالی سەرڕیگای بانگەوازی ڕاستە شەقامی خوای گەورە

بەهەمیشەیی لە گوناهو تاواندا گەوزاون و هیچ چاکەیەکیان بۆ نەماوە ، ئەوەتا خوای گەورە بەرپەرچی جولەکەی بەد ڕەفتار دەداتەوە کە دەیان ووت تەنها چەند ڕۆژیٚک لەدۆزەخدا دەمینینەوە ئەو جولەکانەی بەردەوام ڕیگرو بەربەست بوین لەڕیی موسوڵماناندا هەمیشە خراپەو بەد ڕەوشتی وبیٚباوەڕی لەسەر زەوی تەشەنە پیٚدەدەن ،

خوای گەورە و میهرەبان دەفەرمویت : (بلى من كسب سيئة وأحاطت به خطيئته فأُولئك أَصحاب النار هم فيها خالدون) (البقرة/٨١) .

واتە (ئەریٚ کەسیٚک گوناه بکا و شوینەواری شوومی ئەوە دەوری گرتبیت ، جائەوانە ئەهلی ئاگرن و بەهەمیشەیی لەناو ئاگردا دەمێننەوە ) .

لەبەرئەوەی بیٚباوەڕان هیندە تاوان و خراپەکاری دەکەن ، دەبیتە پیشەیان و ئابلوقەیان دەدەن وەک دەوردانی بازن بۆمەچەک ، وەلەهەموو ئاڕاستەیەکەوە ئاگر هیرشیان بۆدەبات وهیچ بواری قوتاربوونیان نادات

وەک خوای گەورە دەفەرمویت (لهم من جهنم مهاد ومن فوقهم غواش) (الاعراف/٤١) .
واتە: (لەدۆزەخدا ڕایەخ و سەرپۆشیان بۆهەیە ، وەئابەم جۆرە ستەم کاران سزا دەدەین) .
(مهاد) واتە ڕاخەری ژێریان و (غواش) ئەو پەردە ئاگرینەیە بەسەریانەوە دەبێت ، واتە ئاگر دەوریان دەدات .

وەک خوای باڵادەست دەفەرمویت : (يوم يغشاهم العذاب من فوقهم ومن تحت ارجلهم) (العنكبوت/٥٥) . واتە: (ڕۆژێ سزا لەسەر سەریانەوە وەلەژێر پێیانەوە ئەوان دەگرێتە بەر) .

وە هەروەها پەروەردگاری مەزن دەفەرمویت: (لهم من فوقهم ظلل من النار ومن تحتهم ظلل) (الزمر/١٦) . واتە: (بۆ ئەوانە لەسەر سەریانەوە سێبەری ئاگرو لەژێریانەوە سێبەرەکانی ئاگر هەیە) .

وەلەجێیەکی تردا بەڕاستەو خۆیی ئاماژە بۆ (احاطة) و دەورانی ئاگر بۆبێباوەڕان دەکات و دەفەرمویت : (وان جهنم لمحيطة بالكافرين) (التوبة/٤٩) . واتە : (وەبەڕاستی دۆزەخ دەوری بێباوەڕانی داوە) .

ئەم ئایلوقەدانە لەڕوویەکی تریشەوەیە :-
ئەویش بەوەی ئاگر وەک پەرژین و سیاجێک دەوری بێباوەڕان دەدات بەجۆرێ کەناتوانن بەجێی بهێلن یان دەرچن تیایدا ،

وەک خوای گەورە دەفەرمویت : (انا اعتدنا للظالمين نارا احاط بهم سرادقها وان يستغيثوا يغاثوا بماء كالمهل يشوي الوجوه بئس الشراب وساءت مرتفقا) (الكهف/٢٩)
واتە : (بەڕاستی ئێمە بۆ ستەمکاران ئامادەمان کردووە ئاگرێک کە گڕەکەی لەهەموو لایەکەوە دەوری ئەوانی داوە ، ئەگەر داوای یارمەتی بکەن ، بەئاوێک یارمەتی دەدرێن وەک قوڕقوشمی سوور بووەوە کەدەم وچاویان دەبرژێنێ ، چەند خواردنەوەیەکی خراپەو چەند نیشتگەیەکی خراپە کەهاوەڵی دیوو کافرانن) هەندێ لەتەفسیری (سرادقها ) دەفەرموون : واتە پەرژین و دیواری ئاگرین .

وەفەرموویەتی (لو يعلم الذين كفروا حين لايكفون عن وجوههم النار ولاعن ظهورهم ولاهم ينصرون بل تأتيهم بغتة فتبهتهم فلا يستطيعون ردها ولاهم ينظرون) (الأنبياء/٣٩)

واتە: (ئەگەر بێباوەڕان بزانن کاتێ ئاگر لەڕوو چاویان و پشتیان وازناهێنێت و کەس سەریان ناخات پشت گیریان ناکات ، بەڵکو سزاکە لەپڕ بۆیان دێتکەناتوانن بیگەڕێننەوەو دوای بخەن) .

## سیو هەشت: ئەو تاوانانەی هەرەشەی چوونە دۆزەخی لێکراوە

بێگومان ئەو تاوانانەی دەبنە هۆی چوونە دۆزەخ زۆرن لێرەدا بەکورتی باس لەهەندێکیان دەکەین بەپشتیوانی خوای گەورە ، خوازیارین کەلێی بەدووربین :-

### ١- ئەو کۆمەڵانەی دژ بە ئەهلی سوننە و جەماعەتن

بێگومان ئەم ئوممەتە وەک جولەکە و فەلە دەبنە کۆمەڵی جیاجیاو هەر تەنها یەک کۆمەڵیان لەسەر حەقن ،

وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت : **(الا ان من قبلكم من اهل الكتاب افترقوا على ثنتين وسبعين ملة ، وان هذه الملة ستفترق الى ثلاث وسبعين ، ثنتان وسبعون في النار ، وواحدة في الجنة وهي الجماعة)** (٧٨)

واتە: (ئاگاداربن پێش ئێوە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان (جولەکەو گاور) بوونە حەفتاو دوویەش (کۆمەڵ) ، ئەم ئوممەتە دەبێتە حەفتاو سێ کۆمەڵ ، حەفتاو دوو کۆمەڵیان دەچنە ئاگر ، یەکێکیان دەچێتە بەهەشت ، کەئەویش کۆمەڵی موسوڵمانانە (جماعة) ) (٧٩)

واتاو تێگەیشتن لەم فەرموودەیە وتوێژی زانایانی لەسەرە ، بەڵام بەباشم زانی خۆمانی لەقەرەنەدەین ، ئەوەی زانراوە کەهەندێ لەم کۆمەڵانە کافرن و بەهەمیشەیی لەدۆزەخدا دەمێننەوە ، وەک : (اسماعيليه ، الدروز ، والنصيريه) ...هتد ، کەئەمانە وانیشان دەدەن بڕوادارن بەڵام لەناخیاندا بێباوەڕن (٨٠)

. هەندێکی تر لەم کۆمەڵانە لەزۆر شتی گەورەو گرنگی ئەم ئیسلامەدا خیلافیان لەگەڵ ئەهلی سوننەو جەماعە هەیە ، بەڵام نەگەیشتۆتە ئاستی کوفر، ئەمانەش دەکەونە ژێر سێبەری بەزەیی خوای گەورە ، ئەگەر ویستی کرد لێیان خۆش دەبێت ئەگەرنا بۆ دۆزەخ دەیان نێرێت (خوای گەورە پەنامان بدات) .

---

(٧٨) (رواه ابو داود والدارمي واحمد والحاكم) .

(٧٩) (ئەم فەرمودەیە -صحيح-ە بۆ زیاتر زانیاری زانین لەبارەیەوە بگەڕێرەوە بۆ (سلسلة الاحاديث الصحيحة/٢٠٤)

(٨٠) (الجنة والنار)

لەوانەیە بەکاری خێری گەورە یان بەشەفاعەتی شەفاعەتکاران بچنە بەهەشتەوە یان ماوەیەک خوای گەورە ویستی لەسەر بێت لەدۆزەخدا دەمێننەوە پاشان دەچنە بەهەشت .

## ٢- کۆچ نەکردن

ئەوەی گومانی تیانییە مانەوە لەووڵاتی بێباوەڕاندا دروست نییە ئەگەر ووڵاتی ئیسلامی هەبوو بەتایبەتی ئەگەر لەو شوێنە توشی بەلاو فیتنەی زۆر دەبوو . خوای گەورە بەهانەی ئەوانەی وەرنەگرت کەکۆچیان نەکرد

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمویت : **(ان الذين توفاهم الملائكة ظالمي انفسهم قالوا فيم كنتم قالوا كنا مستضعفين في الارض قالوا الم تكن ارض الله واسعة فتهاجروا فيها فاولئك مأواهم جهنم وساءت مصيرا الا المستضعفين من الرجال والنساء والولدان الذين لايستطيعون حيلة ولايهتدون سبيلا) .(النساء/٩٨)**

واتە : (بەڕاستی ئەوانەی فریشتە گیانی کیشاون ، لەکاتیکدا کەئەوانەی ستەمیان لەخۆیان کردووە بەکۆچ نەکردن و مانەوە لەولاتی بێباوەڕاندا و ڕازی بوون بەهاوسێیەتی بێباوەڕان ، فریشتەکان لەکاتی گیانەللادا بەتەشەرەوە ، پێیان دەڵین : ئایا ئێوە لەچیدابوون لەبارەی ئاینتانەوە ؟ ئەڵین :

ئێمە داگیرکراو و ژێر دەستە بووین . فریشتەکان دەڵێن : ئایا خاکە و ووڵاتی خوا فراوان نەبوو تا کۆچتان بکردایە ؟ . ئەوانەجێگەیان دۆزەخە ، دۆزەخ چارەنوس و پاشەڕۆژێکی زۆر بەدو خراپە . بێجگە لەبێدەسەلاتان و ژێردەستەکراوان لەپیاوان و ئافرەتان و منالان کەتوانای هیچ هۆی دەرچوون و کۆچ کردنیان نییە ، لەبەر نەخۆشیو کەفتەکاری یان نەبوونیو بێنەوایی ، بەهیچ جۆرێک ڕێ دەرناکەن و نازانن بڕۆن بۆشوێنی کۆچ کردن . بەهۆی ئەوەوە ئەمانە ئومێد وایە کەخوای گەورە ببورێ لێیان لەو کۆچ نەکردنەیان ) .

لەڕۆشنایی ئەم ئایەتەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەئەوانەی ناتوانن دەرچن لەو ووڵاتەیان ڕێگانازانن بۆ چوون بۆ ووڵاتی ئیسلام بەهانەیان لای پەروەردگار وەرگیراوە .

## ٣- ستەمكاران لە فەرمان ڕەوایی‌دا

شەریعەتی پاكی ئیسلام هاتۆتە خواری بۆمەبەستی سەقامگیری ئاشتی و دادوەری لەسەر زەوی خوای گەورە فەرمانی داوە بەبەندەكانی كەدادوەربن وەك دەفەرمویت: **(إن الله يأمر بالعدل والاحسان)** (النحل/٩٠) واتە: (بەڕاستی خوا فەرمان دەكات بەدادوەری و چاكە كردن ) .

پەروەردگار بەپێویستی داناوە لەسەر لێپسراو و دەسەلاتداران كە دادوەربن لەگەل خەلكی دا **(إن الله يَأمركم أن تـؤدوا الأمانـات إلى أهلها وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل )** (النساء/٥٨)

واتە (خوا فەرمانتان پێ دەدات كە ئەمانەت بگێڕنەوە بۆ خاوەنەكانیان و ئەگەر فەرمان ڕەوایتان گرتە دەست دادوەربن لە حوكمتاندا لەنێوان خەلكی ) .

ئەوتا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) هەڕەشە بەدۆزەخ دەكات لەوانەی كەستەمكارن لە حوكمڕانی‌داو دەفەرمویت : **(القضاة ثلاثة : واحد في الجنة واثنان في النار ، فاما الذي في الجنة ، فرجل عرف الحق وقضى به ، ورجل عرف الحق فجار في الحكم فهو في النـار ، ورجل قضى للناس على جهل ، فهو في النار)**

واتە: (دادوەران سیانن ، یەكێكیان دەچێتە بەهەشت و دوانەكەی تر بۆ ئاگر ، ئەوەی دەچێتە بەهەشت حەق دەزانێت و حوكمی پێ‌دەكات ، ، یەكێكی تریان حەق دەزانێت و حوكمی پێ‌ناكات ، ئەوە بۆ ئاگرە ، وەپیاوێك حوكم دەكات بەناو خەلكی‌دا بەنەزانین ، ئەویش بۆئاگرە ) .

## ٤-درۆكردن بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ)

(ابن الاثـير) لەكتێبی (جـامع الاصـول) بەشێكی لەكتێبەكەی تەرخان كردووە بۆ ئەو فەرموودانەی هەڕەشە لەوانە دەكەن كەدرۆ هەلدەبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) .

لەفەرموودەیەكدا هاتووە : **(لاتكذبوا علي ، فانه من كذب علي يلج في النار)**

واتە: (درۆ هەلمەبەستن بەدەم منەوە چونكە ئەوەی درۆ بكات بەدەممەوە دەچێتە ئاگرەوە) .

هەروەها لەفەرموودەیەكی تردا هاتووە: **(من تقول علي مالم اقل فاليتبوأ مقعده في النار)**

واتە (هەرکەس ووتەیەک هەڵبەستێت بەدەممەوەو من ئەم وتبێت ، ئەوا جێگای خۆی خۆش بکات لەدۆزەخ ) .

لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە : (ان كذب علي ليس ككذب على احد ، فمن كذب علي فاليتبوا مقعده في النار) . واتە (ئەگەر یەکێ درۆ هەڵبەستێت بەدەم منەوە ، وەک یەکێ نییە درۆ بکات بەدەم خەڵکی ترەوە ، چونکە هەرکەس درۆ بەدەم منەوە هەڵبەستێت دەبا شوێنی خۆی خۆش بکات لەناو ئاگردا ) .

## ٥- فیز زلی

خۆ بەگەورە زانین یەکێکە لەتاوانە هەرە گەورەکان ، ئەوەتا لەفەرمودەیەکدا هاتووە : (لایدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من الكبر ، فقال رجل: ان الرجل يحب ان يكون ثوبه حسنا ونعله حسنا ، قال : (ان الله جميل يحب الجمال : الكبر بطر الحق وغمط الناس) واتە : (کەسێ گەردیلەیەک فیز زلی لەدڵیدا هەبێت ناچێتە بەهەشتەوە ، پیاوێک ووتی: پیاو حەز دەکات پۆشاکی جوان بێت ، نەعلەکەی جوان بێت ، ئەویش ووتی : خوای گەورە جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت ، فیز زلی : واتە داپۆشینی حەق و بێڕێز تەماشاکردنی خەڵکییە ) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (اهل النار كل جعظري ، جواظ ، مستكبر) .

واتە : (ئەهلی ئاگر : هەموو کەسێکی توڕەو تیژی خۆبەزل زانی قەڵەوە کەبەفیزەوە دەڕوات وەفیز زلە ...فەرموودەکە ) .

## ٦- کوشتنی مرۆڤێک بەناحەق

خوای گەورە دەفەرموێت (ومن يقتل مؤمنا متعمدا فجزاءه جهنم خالدا فيها وغضب الله عليه ولعنه وأعد له عذابا عظيما ) (النساء/٩٣) واتە: (هەرکەس بەئەنقەس ئیمان دارێک بکوژێت ئەوا پاداشتی دۆزەخە بەهەمیشەیی . تیایدا دەمێنێتەوە وخوای گەورە توڕەیە لێی‌و نەفرەتی لێدەکات وەسزایەکی توندی گەورەی بۆئامادە کردووە ) .

پیاو کوژ شایەنی سزای گەورەی خوایە چونکە دونیاو ئەوەی تیایەتی خوای گەورەکیراویەتی بەمەنزڵگای مرۆڤ وەهەموو شتێکی بۆمرۆڤ بێ دەسەلات کردووە بۆئەوەی لەخێرو بێری بێ بەش نەبێت.نەک مرۆڤ هەستێت لەجیاتی ئاوەدان کردنەوەی زەوی بەیاسای پاکی ئیسلام ، دەست بکات بەکوشتن .

پێغەمبەر (ﷺ) لەزۆر فەرمودەدا هەڕەشەی کردووە لەکوشتنی یەکتری ، وەک دەفەرمویت :
**(اذا تواجه المسلمان بسيفهما فالقاتل والمقتول) في النار ، قال : قلت ، او قيل : يارسول الله هذا القاتل فما بال المقتول ؟ قال : (إنه كان حريصا على قاتل صاحبه )** [٨٢]
واتە : (ئەگەر دوو مسوڵمان بەشمشێرەکانیان ڕوبەڕووی یەکتری بوونەوە ، کوژەر -بکوژ- کوژراو دەچنە دۆزەخەوە ، ووتی : وتم یان وترا : ئەی پێغەمبەری خوا کوژەر لەبەر کوشتنەکەی ، ئەی کوژراو بۆچی ؟ فەرمووی : ئەویش سووربوو لەسەر کوشتنی هاوڕێیەکەی)
هەروەها کوڕە ساڵحەکەی ئادەم دەستی درێژ نەکرد بۆ کوشتنی برا خراپەکەی و، براکەی تری ئەمی کوشت ، **(واتلوا عليهم نبأ ابني آدم بالحق اذ قربا قربانا ، فتقبل من احدهما ولم يتقبل من الآخر قال لأقتلنك قال إنما يتقبل الله من المتقين . لئن بسطت الي يدك لتقتلني ماانا بباسط يدي اليك لأقتلك إني أخاف الله رب العالمين . إني أريد أن تبوأ باثمي وإثمك فتكون من أصحاب النار وذلك جزاء الظالمين)** (المائدة/٢٧-٢٩) .
واتە : (چیرۆکی دوو کوڕی ئادەمیان بەحەق بەسەردا بخوێنەوە ، ئەو دەمەی هەریەک لەو دووانە بۆ نزیک بوونەوە لە (خوا) قوربانیەکیان دا ، بەڵام هی یەکێکیان قەبوڵ کراو هی ئەوی تریان قەبووڵ نەکرا ، (ئەو برایەی واقوربانیەکەی لای خوا قبوول نەکرا بەبراکەی تری) ووت : -حەتمەن ئەتکوژم ، (براکەی تر) ووتی : (من بێ تاوانم) خواتەنها لەپارێزکاران (قوربانی) قبووڵ دەکا

ئەگەر تۆ بۆ کوشتنی من دەست درێژ بکەیت من بۆ کوشتنی تۆ دەست درێژکەر نیم بەڕاستی من لەپەروەردگاری جیهانیان دەترسم . بەڕاستی دەمەوێ گوناهی من خۆت هەڵگری ببیەو ببیتەجەهەننەمی ، وەئەمە سزای ستەم کارانە . جانەفسی سەرکێشی (قابیل) بەرەبەرە رام بوو وەلێبڕا بۆ کوشتنی (هابیل)ی برای خۆی ، جائەوی کوشت هەرلەبەر ئەمەشە لەزەرەرومەندان بوو ، جاخوا قەلەڕەشەیەکی نارد ، کەبەدەنووک و چنگ زەوییەکەی دەکۆڵی و وەلای ئەدا -لاشەی شاردەوە- تاخوا نیشانی -قابیل- بدات کەچۆن لاشەی برای خۆی هابیل بشارێتەوە قابیل ووتی : وای بۆمن ئایا من ناتوانم وەکو ئەم قەلە ڕەشە بم ، و لاشەی هابیلی برام لەبن خاک بشارمەوە ؟ جا بوو بەیەکێک لەپەشیمان بووان)

(٨٢) (رواه البخاري في صحيحه /كتاب الديات ، فتح الباري / ١٢-١٨٧)

### ٧-سووخۆر

کاتێ پەروەردگاری مەزن سامان بە یەکێ دەبەخشێ لەم دونیایەدا ،بۆ ئەوەی دەست گیرۆی هەژاران و قەرزاران و لێقەوماوان بکات نەک هەل پەرست بێت و باری ناهەمواری خەلکی لێ ئەوماو بقۆزێتەوە و قەرزیان بداتێ بەسوو ، ئەویش لەناچاریدا قبولی بکات .وەلەوانەشە هەر بۆی نەدرێتەوە و ناچاربێت بەوەی خەلکی مالی بەتالان بەرن .

لەئاینی پیرۆزی ئیسلام دا (سوو) لەگوناهە گەورەکانە وەلەداوێن پیسی گەورەترە .سزای پڕ ئێش ترو گەورە ترە .خوای گەورە بەتوندی هەڕەشە لەوانە دەکات کەدەزانن و پێ یان دەگات کەسوو حەرامە و دەستی لێ هەل ناگرن .

بۆیە دەفەرموێت: (ومن عاد فاولئك أصحاب النار هم فيها خالدون) (البقرة/٢٧٥) واتە: (هەرکەس دوای زانینی حەرامی (سوو) گەڕایەوە بۆسوو خواردن ئەوانە ئەهلی دۆزەخن و بەهەمیشەیی تیای دەمێننەوە ) .

هەروەها خودای میهرەبان فەرموویەتی : (ياأيها الذين آمنوا لاتأكلوا ربا أضعافا مضاعفة واتقوا الله لعلكم تفلحون ، واتقوا النار التي أعدت للكافرين) (آل عمران/١٣٠-١٣١)

واتە : (ئەی کەسانێ کەبڕواتان هێناوە ! سوو وەرمەگرن -سوودی پوول مەخۆن- لەخوا بترسن تابەلکو ڕزگار بن وەخۆبپارێزن لەئاگرێک کە بۆ کافران ئامادە کراوە وەپەیڕەوی خواو پێغەمبەر بکەن تابەلکو بەر ڕەحمەتی خوابکەون) .

وەپێغەمبەری (ﷺ) سەروەرمان لەحەوت تاوانە هەرە گەورەلەناویەرەکەی ناوبردوە .ئیتر کاتێ ئەوە هاتووە دەولەمەندان دەستی لێ هەلبگرن پێش ئەوەی مردن یەخەیان پێ بگرێت وتووشی سزای پڕ ئێشی دۆزەخ ببن .خوایەپەنامان بدەیت .

### ٨-مالی خەلکی خواردن بەناهەق

ئاینی بێ گەردی ئیسلام ڕێ بە هیچ جۆرە ستەمێک نادات و بەیاساغی داناوە ، مالی خەلکی خواردن بەناهەق ستەمەو یاساغە لەبەرنامەی ئیسلام دا .

بۆیە خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفـەرموێ: (یاأیها الذین أمنوا لاتأکلوا أموالکم بینکم بالباطل الا ان تکون تجارة عن تراض منکم ولاتقتلوا أنفسکم إن الله کان بکم رحیما ومن یفعل ذلك عدوانا وظلما فسوف نصلیه نارا وکان ذلك على الله یسیرا) (النساء/٩٧)

واتە (ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ،ماڵ و سامانەکانتان بەناهەق لەناو خۆتـان دا مەخۆن ، بەلام ئەگەر ئەو ماڵ وسامانە لەبازرگانی‌یەکەوە بەکار بهێنرێ کە بەڕەزامەندی نێوان خۆتـان بێت ئەوە چاك و دروستە ، خۆتان مەکوژن - بەوەدەست نیشان دەکات یەوەی خواردنی ماڵ و سامان بەوجۆرە ناهەقانەی کەباس کران کارێکی بەد و کوشندەیە بۆ ژیانی گەل و کۆمەل - بەڕاستی خوا میهرەبان و خاوەن بەزەیی یە پێتان ،هەرکەس ئەوکارە بەدانە بکات بەستەم و دوژمنایەتی ئـەوە بەهەڵەو نەزانین ئەو کەسە ئەسوتێنین لەئاگردا ئەوەش شتێکی ئاسانە لەسـەر خـودا) ئـەم ماڵ خواردنەش بێگومان ماڵی هەتیو دەگرێتەوە و دروست نی‌یە و زۆر یاساغە.

هەروەها خـودای گەورەومیهرەبانلەبارەی مـالی هـەتیوو فەرموویـەتی : (إن الذین یاکلون اموال الیتامی ظلما إنما یاکلون في بطونهم نارا وسیصلون سعیرا) (النساء/١٠) . واتە : (ئـەو کەسانەی ماڵی هەتیو دەخۆن بەستەم ، لەڕاستی‌دا ئەوانە ئاگر دەخۆن لەسـکیاندا وەدەچنە ناو دۆزەخەوە) .

## ٩-وێنەگران (المصوررون)

توندترین سزای ڕۆژی دوایی بۆ وێنەگرانە ، چونکە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی (**أشد الناس عذابا عند الله المصورون**) واتە( توندترین و سەخت ترین سزا لای خوا بۆ وێنە گرانە ) .

وەهەروەها پێشەوامان (ﷺ) دەفەرموێت : (**کل مصور فی النار ، یجعل له بکل صورة صورها نفسا فیعذبه الله فی جهنم**)

واتە : (هەموو وێنە کێشێك لەناو ئاگرە ، هەر وێنەیەکی کێشاوە دەیکرێت بەنەفسێك . خوای گەورە سزای دەدات لەدۆزەخ دا) .

هەروەها دەفەرموێت: (**ومن أظلم ممن ذهب یخلق کخلقی**)

واتە: (کێ لەوە ستەمکار ترە کە لەوێنەی دروستکاری من دروست دەکات )

## ١٠- سزادەرانی ئاژەڵ

بەڵێ ئاژەڵ دروست کراوە بۆ خزمەتی مرۆڤ ، بەڵام سزاو ئازاردانیان تاوانەو ئیسلام ڕێگانادات پێی وەک لەم فەرموودەیەدا هاتووە : ( **عرضت لى النار فرايت فيها امرأة من بني اسرائيل تعذب في هرة لها ، ربطتها فلم تطعمها ، ولم تدعها تأكل من خشاش الارض ، حتى ماتت جوعا** ) [٨٣]. واتە : (دۆزەخم نیشاندرا ، ئافرەتێکی بەنی ئیسرائیلیم بینی لەبەر پشیلەیەک سزا ئەدرا (لەدنیادا) بەستبوویەوە خواردنی نەئەدایە و بەرینەئەدا لەگژوگیای زەوی بخوات هەتا لەبرساندا مردار بوویەوە ) .

باشە ئەگەر کەسێ سزای پشیلەیەک ، ئەمە چارەنووسی بێت ئەبێت ئەوانەی سزای ئیمانداران و بانگەواز کاران و پیاوچاکان ئەدەن ، ئەبێت جێیان لەدۆزەخدا چی بێت دەبا دوژمنانی خوا و بێئاگایان ئاگاداربینەوە

## ١١- نیازپاکی نەبوون لەوەرگرتنی زانست

فێربوونی زانست لەبەر ڕەزامەندی غەیری خوا تاوانە ، وەپێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە لێی دەفەرموێت ( **لاتعلموا العلم لتباهوا به العلماء ولا تماروا به السفهاء ، ولاتخيروا به المجالس ، من فعل ذلك فالنار النار** ) . واتە: (زانست فێرمەبن بۆ فیز کردن بەسەر زاناکانەوە وموناقەشە کردن لەگەڵ نەزانەکان ، هەرکەس ئەوە بکات ئەوە ئاگر دەبێتە چارەنووسی ) .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( **من تعلم علما لغير الله ، او اراد به غير الله ، فليتبوأ مقعده من النار** ) واتە : (هەرکەس زانستێک فێر ببێت بۆ غەیری خوا یان ویستی ڕەزامەندی غەیری خوای کرد پێی دەبا شوێن لەئاگر خۆش بکات ) .

## ١٢- ئافرەتی داپۆشراوی بێ پۆشاک

خوای گەورە بە بەزەیی خۆی هاوڕێ و هاوسەری بۆ پیاو بڕیاردا ، وەبۆئەوەی پیاو یەک باڵ نەبێت لەژیانیدا و ئافرەتان ئەو کەلێنە گەورەیەی پیاوان پڕکەنەوە و بەهەردووکیانەوە هەڵگری مەشخەڵی ئاوەدان کردنەوەبن ، لەژێر ڕۆشنایی پرۆگرامی پەروەردگاردا - پێکەوە ژیانی ئاسودەیی و ئاشتی و کامەرانی بەسەربەرن دووربن لە سەرپێچی و تاوان

(٨٣) (رواه مسلم / مشكاة المصابيح)

بەڵام ئەمڕۆ هەندێ لەئافرەتان وەکو پیاوانی لادەر لەئاین مەشخەڵی دوور لەئاینیان بەرز کردۆتەوەو لەپۆشاکی ئیسلامی‌یان کۆچیان کردووە . بێ گومان ئەمەش تاوانیکی گەورەیەو خوای گەورە مۆڵەتیان دەدات کە بگەڕینەوەو خۆیان داپۆشن ، ئەگەرنا لەقیامەتدا بەر سزاو تووڕەیی خوای گەورە دەکەون .

وەک کورد واتەنی : (تۆڵە بەسەبرە بەڵام بەزەبرە ) هەروەها عەرەبیش دەڵێت: ( ان الله یمهل ولایهمل ) واتە خودا مۆڵەت دەدا بەڵام هەرگیز هیچ شتێک ئیهمال ناکات

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ( صنفان من اهل النار لم ارهما ، قوم معهم سیاط کاذناب البقر یضربون بها الناس ، ونساء کاسیات عاریات ممیلات مائلات ، رؤوسهن کاسنمة البخت المائلة ، لایدخلن الجنة ولایجدن ریحها وان ریحها لتوجد من مسیرة کذا وکذا ) (٨٤)

واتە : ( دوو کۆمەڵ هەن لەئەهلی ئاگر ئەم بینیوون ، قەومێک قامچیان پێیە وەک کلکی مانگا لەخەڵکی پێ ئەدەن ، وەئافرەتانی داپۆشراوی ڕوتی بەلەنجەولاری بەفیز سەریان (قژی سەریان) وەک سەرپشتی حوشتر وایە ، نەئەچنە بەهەشتەوەو نەبۆنیشی دەکەن ، وەبۆنی بەهەشت ئەندازەیی ئەوەندەو ئەوەندە ڕێگادەڕوات ) .

کۆمەڵی لێپرسراو قامچی‌یان بەدەستە لەهەموو سەردەمێکدا هەن و ئاگاداری ئەم هەڕەشەیە بن و وەبیداربینەوە ، پێش ئەوەی کۆچیان دەست پێ بکات . پێش ئەوەی قامچی خودا ملی ڕێگایان پێ بگرێتە بەر سەر شۆڕ و مەلول بکرێن .

## ١٣- مەیل دان بەستەم کاران

بێ گومان یەک لەهۆیەکانی چوونە دۆزەخ مەیل دانە بەستەمکاران و دوژمنانی ئاین (ولاترکنوا الی الذین ظلموا فتمسکم النار) (هود/١١٣) واتە : (پاڵ مەدەن بەستەم کارانەوە ، جا (ئەگەر مەیلتان بۆ لای ستەمکاران بێت ئاگر ئەتان گرێتەوە ) .

(٨٤) (اخرجه مسلم) .

### ١٤- پاداشتی خۆکوشتن

ئەمەش یەکێکە لەتاوانە گەورەکان . ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (**من قتل نفسه بحديدة ، فحديدته في يده ، يجأبها في نار جهنم خالدا مخلدا فيها ابدا ومن قتل نفسه بسم ، فسمه في يده يتحساه في نار جهنم خالدا مخلدا فيها ابدا ، ومن تردى من جبل فقتل نفسه فهو يتردى في نار جهنم خالدا مخلدا فيها ابدا**)

واتە: (هەرکەسێ خۆی بەئاسنێ بکوژێ ئەوا ئاسنەکەی لەدەست دا دەبێت ، لەئاگری دۆزەخدا دەبێ بەهەمیشەیی و نەمری ، وەهەرکەس خۆی بەژەهر بکوژێ ئەوا ژەهرەکەی لەدەستدا دەبێت بەهەمیشەیی و نەمری ، وەهەر کەس لەشاخێکەوە خۆی بخاتە خوارەوە وەخۆی بکوژێ ئەوا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخ بەهەمیشەیی و نەمری دەمێنێتەوە) .

## سی و نۆ : کێ سزای زۆر سەخت دەدرێت ؟

بێگومان هەرتاوانێک بەئەندازەی گەورەیی و بچوکی ، خوای گەورە سزای تاوان باران ئەداتەوە بەلام هەندێ تاوان هەیە سزاکەی زۆر سەختە ، لەم فەرمودەدا روون کراوەتەوە : (**أشد الناس عذابا يوم القيامة المصورون**) واتە : (توندترین سزای رۆژی قیامەت بۆ وێنەگرانە) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی : (**ان اشد الناس عذابا يوم القيامة رجل قتل نبيا وقتله نبي ...الحديث**) . واتە: (سەختترین و توندترین سزای رۆژی قیامەت بۆ کەسێکە پێغەمبەرێک بکوژێت یان پێغەمبەرێک بیکوژێت ... فەرموودەکە) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : (**اشد الناس عذابا يوم القيامة اشدهم عذابا للناس في الدنيا**) واتە : (توندترین سزا لەرۆژی قیامەتدا بۆ کەسێکە کەتوند ترین سزای خەڵکی ئەدات لەدونیادا) . دەبا جەلادو ستەمکارانی ئەمڕۆی جیهانی بەناو پێشکەوت و دیموکراسی خواز وازبهێنن لەسزادانی موسوڵمان ، چونکە پەیامی موسوڵمانان لەسەرانسەری جیهان پەیامێکی ئاسمانییەو پڕ لەفەڕو بەرەکەت و دادوەرییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی . موسوڵمانان لەجیهاندا جگەلەبانگەواز کردنیان بۆ یەکتاپەرستی و گەردن کەچ بوون بۆتاکە یەک خودا ، ئەبێت تاوانیان چی بێت ؟! دەبا هەموو لێپرسراو و دەسەڵاتدارێکی دنیایی بیر لەسبەینێ بکاتەوەکەدەچێتە حزوری خودا و چۆن وەڵام و پاساوی کارە دڕندانەکانیان دەدەنەوە !

## چل : ئاگر خواردنیان دەبێت

تاوانباران بەسزای پڕ ئێشی جۆراو جۆر دەبرێن ، و بەباری ناهەموارو کەساسیدا دەبرێن ، ئەویش بەهۆی زۆری تاوانیان . ئەوەتا خوای گەورە لەبەرامبەر هەندێ تاواندا فەرمان دەدات پشکۆی ئاگر دەرخواردی دۆزەخییەکان بدرێت -خواپەنامان بدات -

خوای گەورە فەرمویەتی: (إن الذين يأكلون اموال اليتامى ظلما انما يأكلون في بطونهم نارا) (النساء/١٠) واتە : (دیارە کەسانێ کەماڵی هەتیوان بەستەم ئەخۆن ، لەڕاستیدا تەنها ئاگر لەزگی خۆیاندا دەخۆن ) .

وە خودای بەخشندەو میهرەبان لەجێیەکی تردا فەرموویەتی: (ان الذين يكتمون ما انزل الله من الكتاب ويشترون به ثمنا قليلا اولئك ما يأكلون في بطونهم الا النار) (البقرة/١٧٤)

واتە : (ئەوەی لەکتێبدا خوا نازڵی کردووە ئەوانەی دەیشارنەوە بەنرخی کەم دەیفرۆشن ئەوانە جگە لەئاگر شتی تر ناخەنە زگیانەوە ) .

پێشتر باس کرا کەپۆشاکیان لەئاگر بۆ دروست دەکرێت وەک خودای باڵادەست فەرموویەتی :

(فالذين كفروا قطعت لهم ثياب من نار يصب من فوقهم الحميم) (الحج/١٩)

واتە : (ئەوانەی بێباوەڕبوون پۆشاکیان لەئاگر بۆ دروست دەکرێت و ئاوی کوڵاو سوتێنەر بەسەریاندا دەکرێت ) .

کاتێ (ئیبراهیمی تیمی ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەم ئایەتەی دەخوێندو دەیفەرموو : ((سبحان الله) پاکی و بێگەردی بۆ خوا کێ لەئاگر جلو بەرگ دروست دەکات .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : (وترى المجرمين يومئذ مقرنين في الاصفاد ، سرابيلهم من قطران وتغشى وجوههم النار) (سورة ابراهيم /٤٩) .

واتە : (وەلەو ڕۆژە -ڕۆژی دواییدا- تاوانباران پێکەوە لەکۆت و زنجیردا دەبینی ، کراس و جلەکانیان لەقەیتەران -واتەماددەیەکی چەسپناکی بەدی گراوییە- وەئاگر دەم و چاویان دادەپۆشێت )

# چل و یەك: زۆرینەی خەڵكی دۆزەخین

مرۆڤ زۆر زوو خوا لەیاد دەكات وسەرپێچی فەرمانەكانی دەكات ، هەندێ جاریش دژایەتی بەرنامەكەی پەروەردگاری مەزن دەكات ، ئەمەش وای كردووە ، زۆربەی خەڵكی شایەنی دۆزەخ بن

وەك خوای گەورەو میهرەبان فەرمویەتی : **(وما اكثروا الناس ولو حرصت بمؤمنين)(یوسف/١٠٣)**

واتە: (زۆربەی خەڵك هەرچەند تێبكۆشێ بڕوا ناهێنن)

وەك پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی : **(ولقد صدق عليهم إبليس ظنه فاتبعوه الا فريقا من المؤمنين)** (سباء/٢٠) واتە : (بەڕاستی شەیتان لەبابەت ئەوانەوە گومانێ خۆی جێبەجێ كرد ، جا بێجگە لەدەستەیە لەبڕواداران ، ئەوانی دیكە هەموو پەیڕەوی شەیتانیان كرد) .

خوای گەورە بەشەیتانی فەرمووە : **(لأملئن جهنم منك وممن تبعك منهم أجمعين)(ص/٨٥)**

واتە: (بەڕاستی دۆزەخ لەتۆو ئەوەی شوێن تۆ دەكەوێ پڕی دەكەم) .

بێگومان هەركەس بێباوەڕ بێت دەچێتە دۆزەخ ، وەزۆر لەنەوەی ئادەم بێباوەڕن ، بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەمیشە بەرەڵستی بانگەوازی پێغەمبەرانیان (ﷺ) كردووە ، زۆر كەم لەخەڵكی بەدەم بانگەوازەوە چوون و بەڕاستی باوەشیان بۆ كردۆتەوە . ئەوەتا لەڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەر (ﷺ) دیت نزیكی (١٠) كەس باوەڕی پێهێناوە ،

وەپێغەمبەر (ﷺ) هەیە دوو یان یەك پیاو باوەڕی پێهێناوە ، هەتا پێغەمبەری وا هەیە تاكە یەك كەسیش باوەڕی پێنەهێناوە ،

ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : **(عرضت على الامم فرأيت نبي ومعه الرهيط ، والنبي ومعه رجل ورجلان ، والنبي وليس معه احد...)**

واتە: (لەقیامەتدا ئومەتانیان نیشان دام پێغەمبەری وەهامەیە كۆمەڵێكی لەگەڵدایە ، پێغەمبەرێك پیاوێك یان دوو پیاوی لەگەڵدا بوو ، پێغەمبەرێك كەس بڕوای پێ نەهێنا بوو ...) .

وەلەفەرمودەیەكی ڕاستدا هاتووە كەلەهەزار كەس (٩٩٩) كەس دەچێتە دۆزەخەوە تەنها یەكێك بۆ بەهەشت دەچێت . لەڕۆژی قیامەتدا ئەو ڕۆژەی هەموو لەمەحشەردا كۆبوونەتەوە بۆ ماوەی (٥٠٠٠٠) هەزار ساڵ ڕادەوەستن هەموو خەڵكی لەناڕەحەتی و بێزاری و ترس و بیمدان بەجۆرێك هەموو خەڵكی دەچنە خزمەتی یەك یەكی پێغەمبەران بۆ شەفاعەت كردن و دەست

پێ‌کردنی موحاسەبە ، بەڵام پێغەمبەران (ﷺ) کەسیان ناتوانن بەدەم بانگەوازی خەڵکیەوە بڕۆن . ئاڵەو ڕۆژە ترس و بیمەدا کەخەڵکی هەریەکە بەپێی تاوانەکانیان لەناوەقی لەشدا نوقم دەبن ، ئاڵەو ڕۆژە بێ‌پشووەدا خوای گەورە فەرمان دەدات بەپێغەمبەر (ﷺ) بۆ دەرهێنانی کۆمەڵی ئاگر ، ئادەم پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : (**ومابعث النار**) واتە کۆمەڵی ئاگر کێ‌یە ؟

خوای گەورەش دەفەرموێت: (**من كل الف تسعمائة وتسعة وتسعين**) واتە (هەریەک هەزار نۆسەدو نەوەت و نۆ بۆ ئاگر) ئاڵەو ساتە پڕ نەهامەتی‌یەدا کە زۆر لەناڕەحەتی دەبیزرێن بەشێوەیەک منداڵ پیردەبێت و سەری سپی دەبێت ، وەئافرەتانی سک پڕ سکەکەیان دائەنێن ، وەخەڵکی هەمووی سەرخۆش دیارن بەڵام سەرخۆش نین ، بەڵام سزای خوا سەخت و پڕ ئێشە وەک ، ئائەم کاتە خەڵکی (هاوەڵان) زۆر دەترسن و بارەکەیان لاگران دەبێت . بۆیە هاوەڵان بەیەکجار وتیان : (ئەی پێغەمبەری خوا کام لەئێمە ڕزگاری دەبێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مژدەبێ ، لە یأجوج مأجوج ، هەزار کەس لەوان و یەک کەس لەئێوە ) ، (**ابشروا فان من ياجوج ومأجوج الف ومنكم رجل**) .

پاشان فەرمووی : (خوازیارم سێ‌یەکی بەهەشتی ئێوەبن ، ئێمەش سوپاس و ستایشی خوای گەورەمان کرد ، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (**والذي نفسي بيده اني لأطمع ان تكونوا شطر اهل الجنة ، ان مثلكم في الامم كمثل الشعرة البيضاء في جلد الثور الاسود...الحديث**)

واتە : (سوێندبێ بەوەی گیانی منی بەدەستە خوازیارم نیوەی ئەهلی بەهەشت ئێوەبن وە وێنەی ئێوە لەناو ئوممەتاندا وەک مویەکی سپی‌یە لەناو گایەکی ڕەشدا ...... فەرموودەکە ) .

ئەم فەرموودەیەش چەند ریوایەتێکی تری هەیە ، لەریوایەتێکی تردا ئایەتێکی هێناوە ئەمەیە کە خوای بەخشندە و میهرەبان فەرموویەتی : (**ياايها الناس اتقوا ربكم ان زلزلة الساعة شيء عظيم ، يوم ترونها تذهل كل مرضعة عما ارضعت وتضع كل ذات حمل حملها وترى الناس سكارى وماهم بسكارى ولكن عذاب الله شديد**) (سورة الحج/١-٢)

واتە : (ئەی خەڵکینە لەپەروەردگارتان پەرواتان - پارێزکار بن - هەبێت کە بەڕاستی لەرزەی ئەم ڕۆژی قیامەتە زۆر گەورەو مەترسی دارە ڕۆژێکە (ئەوەندە سامدارە ) هەرشیردەرێک - مەبەست لێرەدا ئافرەتی شیردەرە - لەترسان ساوای شیرە خۆرەی خۆی بەجێ‌دێڵێ ، وەهەردوو

گیانێک بەردەوام -هەموو ئافرەتێکی سک پڕ منداڵەکەی سکی لەبار دەچێت-، وە هەموو خەڵک مەست - سەرخۆش - دەبینی ، کەچی مەست نین ، بەڵام سزای خوای گەورە سەختە ) ؛ (مرضعة) ژنێکە مەمکی لەزاری منداڵەکەیدا بێ و خەریکی شیردانی بێت ) .

## چل و دوو : کۆمەڵێک بۆخۆیان لەئاگردان

گومانی تیانییە ، کافرو موشریک لەئاگردان ، خوای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی هەندێکمان دەدەنێ کەکۆمەڵێ لەئاگردان لەوانە :-

### ١- فیرعەون

خودای بەخشندە و میهرەبان دەفەرموێت : (يقدم قومه يوم القيامة فاوردهم النار)(هود/٩٨)

واتە : (ئەو لەو رۆژەدا لەپێش هۆزەکەیەوە دەبێت ، جانەوان (لەباتی بۆ ئاو بەهەشت) بیانبات ئەیان باتە ناو ئاگر...) .

دەبا ئەمڕۆ فیرعەون ئاساکان لە کاری فیرعەونانەیان پاشگەز ببنەوە و تەوبە بکەن پێش ئەوەی کارلە کار بترازێت و ئیتر کاتی پەشیمانی نەمێنێت .

### ٢- خێزانی (لوط) پێغەمبەر (ﷺ) و (نوح) پێغەمبەر (علیهم الصلاة و السلام)

خودای بالادەست فەرموویەتی : **(ضرب الله مثلا للذين كفروا امرأة نوح وامرأت لوط كانتا تحت عبدين من عبادنا صالحين فخانتاهما فلم يغنيا عنهما من الله شيئا وقيل ادخلا النار مع الداخلين)** (التحريم/١٠) .

واتە : (خوا بۆ بێباوەڕان بەژنی نوح ژنی (لوط) نمونە دێنێتەوە کەهەردووکیان خێزانی دووان لەبەندە ساڵحەکانی ئێمەبوون ، جا خیانەتیان لەو دووانە کرد ، جا ئەو دوو پێغەمبەرەش نەیانتوانی بەژنانی خۆیان لە بەردەم خوا سوودێ بگەیەنن وەپێیان وترا : برۆنە ناو ئاگر لەگەڵ ڕۆیشتوەکان)

## ٣- ئەبو لەهەب و خێزانەکەی

(تبت يدا ابي لهب وتب ، ماأغنى عنه ماله وماكسب ، سيصلى ناراً ذات لهب وامرأته حملة الحطب في جيدها حبل من مسد) .
(المسد/١-٥)

## ٤- عەمری کوڕی عامری خوزاعی

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : عەمری کوڕی عامری خوزاعیم لەدۆزەخ دا بینیوە کەبەریخۆڵەکانی ڕادەکێشرێت .

## ٥- کوژەری عەمار

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (قاتل عامر وسابه في النار) واتە: (کوژەری عامرو جوێندەری لەئاگردایە ):

## چل و سێ: کاریگەری ئاگر لەسەر دنیاو ئەهلەکەی

بەڵێ ئاگری دونیاش هەرچەندە هێندەی ئاگری دۆزەخ گەرم و بەتین نیيە ، کەچی هێشتا نارەحەت و پڕ ئێشە ئەگەر بەشێک لەلەشمان بسوتێت . ئەمە لەلایەک لەلایەکی ترەوە ئاگری دۆزەخ هێندە بەتین و کڵپەکەی گەورەیە کاریش لەژیانی دونیا دەکات

ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی **(اشتكت النار الى ربها فقالت: ( رب اكل بعضي بعضا ، فاذن لها بنفسين ، نفس في الشتاء ، ونفس في الصيف ، فاشد ما تجدون من الحر ، واشد ما تجدون من الزمهرير)**

واتە: (ئاگر سکالای بردە لای پەروەردگار وتی: ئەی پەروەردگار بەشێکم بەشێکمی خوارد، مۆڵەتی دوو ئەفەسی درایە: هەناسەیەک لە زستانە، وەهەناسەیەک لەهاویندا: کەمترین رۆژی کەبەسەرتاندا دێت (هەستی پێ دەکەن) وەساردترین پلەی بەستن (زمهریر)).

هەروەها ئەبو سەعید (ﷺ) فەرمویەتی: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ابردوا بالصلاة، فان شدة الحر من فيح جهنم) واتە: (خۆتان سارد بکەنەوە بە نوێژ، تینی گەرمی لەهەلاو و گەرمی دۆزەخەوەیە).

## چل و چوار: ئایا کەس ئاگر دەبینێت لە پێش قیامەت؟

پێغەمبەر (ﷺ) ئاگری دۆزەخی بینیوە وەک چۆن بەهەشتی بینیوە لەژیاندا.

ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (**انى رأيت الجنة فتناولت عنقودا، ولو اخذته لاكلتم منه ومابقيت الدنيا، ورأيت النار فلم اركاليوم منظر قط افظع، ورأيت اكثر اهلها النساء**)

واتە: (بەهەشتم بینی دەستم برد بۆ هێشووە ترێیەک ئەگەر بمگرتایە (بمهێنایە) ئەوا لێتان دەخوارد هەتا دونیا دەما، دۆزەخم بینی لەو دیمەنەم ناڕەحەت تر نەبینیوە، بینیم زۆربەی ئەهلی ئاگر ئافرەتن).

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (**ان النار ادنيت مني حتى نفخت حرها عن وجهي، فرأيت فيها صاحب المحجن ... الحديث**) واتە: (ئاگر نزیک کرایەوە لێم شالاوی گەرمی بۆ دەم و چاوم کرد، تیایدا خاوەن گۆچانم بینی... فەرموودکە).

هەروەها پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرمووی: (**انه عرضت تعلى الجنة والنار فقربت مني الجنة، حتى لقد تناولت منها قطعا قصرت يدي عنه، وعرضت على النار فجعلت اتأخر رهبتا ان تغشاني، ورأيت امراة حميريتا سوداء طويلة تعذب في هرة لها ربطتها، فلم تطعمها ولم تسقيها، ولم تدعها تاكل من خشاش الأرض، ورأيت فيها ابا ثمامة عمر بن مالك يجر قصبة من النار**)...

واتە: (بەهەشت و ئاگرم نیشان درا، وەبەهەشتم لێ نزیک کرایەوە هەتادەستم بۆنزیک کردەوە دەستم نەیگەیشتێ، ئاگرم نیشان درا خۆم لێ دور خستەوە لەترسی ئەوەی بم سوتێنێ جامن ئافرەتێکی ڕەش بالابەرزی حومەیرێم بینی، سزا ئەدرا لەسەر پشیلەیەک بەستبویەوە

نـەخواردنی ئەدایـەو نـەئاوی ئەدایـە وەرێـی نـەدا بەپشـیلەکە لـەگژو گیـای زەوی بخـوات.
وەئەبونەمامەی کوڕی عامری کوڕی مالیکم بینی ڕای دەکیشێت جل و بەرگێک لەئاگر) .

## چل و پێنج: ئاگر دەمێنێتەوەو لەناو ناچێت

وەک ئیمامی تەحاوی (ڕەحمەتی‌خوای لێبێت) فەرمویەتی(بەهەشت و ئاگر دروست کراون ، لەناوناچن )
زانای پایەبەرز (ابن حزم ) (ڕەحمـەتی خوای‌لی‌بێـت) ڕای (اتفـاق ) نومهـەتی لەسـەر ئـەم باسەهێناوە ، لەکتێبەکـەیدا (الملل والنحل ) دا فەرموویـەتی (هـەموو کۆمەڵـە ئیسلامی یەکان هـاوڕان (متفق) ن لەسـەر مانـەوەی هـەتا هـەتای بەهەشـت و شـادیەکانی ، وەئـاگر و سزاکانی ، - جگەلە جەهمی کوڕی سەفوان نەبێت)
لە(مراتب الاجماع ) (داماتوە :............ئاگر هەقەو ڕاستە ، مالی سزایەو لـەناو ناچێت ، خەڵکەکەیش لەناو ناچێت) ئەمەش ڕای سوننەت وجەماعەتە

## چل و شەش: ئەوانەی دەڵێن ئاگر لەناودەچێت

ئەوانەی کە دژ بە ڕێبازی (مذهب ) ی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن .

### ١-جەهمی

دەڵێت ئاگرو بەهەشت نامێنێتەوە ،ئیمـامی ئەحمـەد لـەکتێبی (الرد على الزنادقة ) باسی کردووە کە جەهمی بڕوایان وایە کە ئاگر و بەهەشت لەناو دەچن ، ئەویش بەرپـەرچی داونەتـەوە بەڵام لەبەرئەوەی سەرباسی نامیلەکەکەمان ئەم باسەنی‌یە بۆیە بەباشـم زانی وەڵام و بەرپـەرچی ئەم کۆمەڵە هەڵبگرین بۆ نامیلکەیەکی تر - إن شاء الله -

### ٢-خەواریج و موعتەزیلە

ئـەم کۆمەڵـە بڕوایـان وایـە هەرکـەس چـووە دۆزەخ بەهەمیشـەیی تیـایی دا دەمێنێتـەوە ،بانەوکەسەش ئەهلی یەکتاپەرستی بێت .هۆی ئەمەش ئەوەیە کەخەواریج موسوڵمانانی تاوان کار بەکافر دەزانن ،هەر موسوڵمانێک تاوانێک بکات ،ئەوا ئەو موسوڵمانە کافرەو بەهەمیشەیی لەئاگردا دەمێنێتـەوە ئـەمـەش ڕای خەواریجـە .بـەڵام موعتـەزیلـە دەڵێـن بەهەمیشـەیی لـەناو دۆزەخ دا دەمێننەوە بەڵام نەکافرن و نەموسوڵمانن لەنێوانیاندان .[illegible]

جێبەجێ دەکرێت ،بەڵام لەقیامەتدا بەهەمیشەیی لەئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە ، بەڵام ئەوەی گومانی تیادا نی یە ئەهلی یەکتاپەرستی با تاوانباریش بن ، دوای ماوەیەک لەدۆزەخدا دەمێننەوەو دەچنە بەهەشت .

**٣-جولەکە**

گومان وا دەبەن لەناو ئاگردا ماوەیەکی کەم دەمێننەوە. خوای گەورەش بەدرۆی خستونەتەوەو لەقورئانە پیرۆزەکەیدا فەرموویەتی : (**وقالوا لن تمسنا النار الا أياما معدودة قل اتخذتم عندالله عهدا فلن يخلف الله عهده ام تقولون علي الله مالا تعلمون .بلي من كسب سيئة وأحاطت به خطيئته فأولئك أصحاب النار هم فيها خالدون**) (البقرة/٨٠-٨١) .

واتە :(وە ووتیان : هەرگیز ئاگری جەهەننەم بێجگە لەچەند رۆژێک توشمان نابێت -نامانگاتێ- بڵێن : ئایا -بۆ ئەم قسەی خۆتان- پەیمانێکتان لای خودا وەرگرتووە -ئەگەر وابوایە دڵنیا دەبوون کەخودا هەرگیز لەبەڵێنی خۆی لانادات ، شتێک ئەدەنە پاڵ خودا کەزانستان پێ نی یە نەرێ کەسێ گوناهێ بکات و شوێنەواری شوومی ئەوە دەوری گرتبێت ، جائەوانە ئەهلی ئاگرن بۆ هەمیشەیی لەئاگردا دەمێننەوە

هەروەها خوای گەورە لەجێگایەکی تر فەرمویەتی : (**الم تر الي الذين أوتوا نصيبا من الكتاب يدعون إلي كتاب الله ليحكم بينهم ثم يتولي فريق منهم وهم معرضون . ذلك بانهم قالوا لن تمسنا النار إلا أياما معدودات وغرهم في دينهم ما كانوا يفترون**) (آل عمران ٢٣-٢٤) .

واتە:(ئایا ئەوانەی کە لەکتێبی -ئاسمانی- بەهرەیەکیان پێدرا بوو ، ئەت دیو -نەتزانی-بۆ لای کتێبی خودا بانگ ئەکران تا -ئەو کتێبە- لەناویاندا دادوەری بکات ، لەپاشا هەندێک لەوانە ڕوویان وەرگێڕا ، ئەوانە کە پشت هەڵکردووەکانن ئەم کردەوەیەی ئەمان کەئەیان ووت بێجگە لەچەند ڕۆژێک ئاگری دۆزەخ هەرگیز لێمان ناکەوێت و -نامانگرێ- وەئەم درۆ دەلەسانە ئەدایە پاڵ خودا ، ئەوانی لەدینەکەیاندا فریوو دابوو و مەغروری کردبوون ، - لەحەق لایاندابوو-

موفەسیری بەناوبانگ (ابن جریـــر ) فەرموویەتی: (جولەکە بڕوایان وایە کە تەنها چل ڕۆژ لەدۆزەخ دا دەبن چونکە ئەوچل ڕۆژە گوێرەکەیان پەرست و توشی سزابوون لەدونیادا )

## ٤-ئیبن عەرەبی تائی

بڕوای وایە کەلەدۆزەخ دا ماوەیەک دەمێننەوە ،پاشان ڕادێن لەگەڵ ئاگردا و بەشێوەیەک (     ) یان ئاگری دەبێت و چێژ لەئاگرەکە دەکەن .

(ابن حجر ) دەفەرموێ :لە (فتح الباري ) دا ئەمەش بۆچونی هەندێ سۆفی زندقییە.

## ٥-هەندێ واگومان دەبەن هەموو خەڵکەکەی دێنەدەرەوە بەڵام

دۆزەخ خۆی دەمێنێتەوە بەهەمیشەیی .

## ٦-بۆچوونی (ابو هزيل الملاف ) کەیەکێکە لەزاناکانی موعتەزیلە

دەڵێت ژیانی ئەهلی ئاگر لەناو دەچێت ،دەبنەبێ گیان و ناجوڵێنەوە ،و هەست بەئازار ناکەن چونکە باوەڕی وایە کەهەموو شتێکی تازە دەبێت لەناو بچێت

## ٧-خوای گەورە کێ ئارەزوی لێ بێت لەدۆزەخ دەری دەکات ،

وەک چۆن لەهەندێ فەرمودەداهاتووە ،پاشان ماوەیەک دۆزەخ دەمێنێتەوە و پاشان لەناودەچێت ،چونکە خوای گەورە ماوەیەکی بۆ دۆزەخ داناوە وکۆتایی دێت .

ئیبن تەیمییە (ﷺ) مەیلی بۆئەم ڕایەش هەبووە :هەروەها قوتابیێ کەیشی (ابن القيم ) بەڵام زانایان هەمیشە بە دوای ئەمبابەتەدا چوون و دەریان خستووە کەئەم حەوت بۆ چونەی سەرەوە بەهەڵەداچوون .،مامۆستای پایەبەرز (حسن خان ) فەرمویەتی: (شێخ مورعی کەرمی حەنبلی نامیلکەیەکی داناوە ناوی ناوە (توفيق الفريقين على خلود أهل الدارين) یەکێ لەو بەشانە نامەی ئیمام موحەممەد کوڕی ئیسماعیل ئەمرن و نامەی موحەممەدی کوڕی عَلي شَوكاني (ﷺ) تیایە کەئەنجامی کتێبەکە ئەوەیە کەبەهەشت و دۆزەخ بەهەمیشەیی دەمێننەوە و ئەهلەکەشی دەمێنێتەوە ) .

مامۆستا احمد ولي الله دەهلەوی فەرمودەناس فەرموویەتی : (بەهەشت و ئاگر ڕاستن ، دروست کراون ئەمڕۆ هەتا ڕۆژی قیامەتیش هەردەمێنێتەوە ) [٨٦] ئنجا لێرەدا بەرپەرچی ئەوانە نادەینەوە دەڵێن دۆزەخ نەمانی بەسەر دێت .

---

(٨٦) (جهنم اهلها و أحوالها ص/١٩)

# چل و حەوت: فراوانی ڕەحمەتی خوای گەورە

**قال الله تعالى: (قل ياعبادي الذين اسرفوا على انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله ان الله يغفر الذنوب جميعا انه هو الغفور الرحيم)** (الزمر/٥٣)

واتە: (بڵێ ئەی بەندەکانی من کەزیادە ڕۆییو ستەمتان لەخۆتان کردووە، لەڕەحمەتی خودا بێ هیوامەبن، بەڕاستی خودا لەهەموو گوناهێک خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەو لێ خۆش بوو بەبەزەیی‌یە، وەبۆلای پەروەردگارتان بگەڕێنەوەو تەسلیمی ئەوبن، بەر لەوەی -پێش ئەوەی- سزاتان بکاتێ، کەلەدوایدا یارمەتی نادرێن -سەرناخرێن-).

ئەمە بانگەشەی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی کەهەموو بەرەو بارەگای ڕەحمەتی خودا بگەڕێنەوەو تەویە بکەن و واز لەگوناه و تاوان بهێنن، خودای باڵادەست و بەتوانا لەگەڵ ئەو هەموو تواناو بەدەسەڵاتی‌یەی کەهەیەتی کەچی بانگی بەندەکانی دەکات بۆ پاشگەز بوونەوە لەگوناهەکان.

**وعن ابي هريرة (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): (لما قضى الله عزوجل الخلق، كتب في كتاب فهو عنده فوق العرش: ان رحمتي غلبت غضبي)** [٨٧]

واتە: (دوای ئەوەی خوای گەورە دروست کراوەکانی دروست کرد، لەکتێبەکەیدا نووسی کەلای عەرشە لای خودا، بەزەیم زاڵ بووە بەسەر تووڕەییم).

**وعن ابي هريرة (ﷺ)، عن النبي (ﷺ) قال: (ان لله عزوجل مئة رحمة، انزل منها رحمة واحدة بين الانس والجن والهوام، والبهائم، فبها يتعاطفون، وبها يتراحمون، وبها تعطف الوحش على اولادها، واخر تسعا وتسعين رحمة يرحم بها عباده يوم القيامة).**

واتە: (خودا سەد بەزەیی هەیە، یەک بەزەیی دابەزاندووتە سەر مرۆڤ و جنۆکەو پەلەوەرو ئاژەڵ، بەهۆیەوە بەزەیی‌یان بەیەکتریدا دێتەوە، و سۆزیان بۆ یەکتری دەجۆشێت، بەهۆیەوە درندە بەزەییان دێتەوە بەسەر بێچوەکانیدا، ئەوانی تر کەنەوەت و نۆن ڕەحمەتی ترە، بەهۆیەوە بەزەیی دەبەخشێت بەبەندەکانی لەڕۆژی قیامەت دا).

---

(٨٧) (اخرجاه في الصحيحين)

**وَعَنْ ابن عباس قال : قال رسول الله (ﷺ) : ( ان ربكم تبارك وتعالى رحيم ، من هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة ، فان عملها كتبت له عشر حسنات الى سبعمائة ضعف ، ومن هم بسيئة فلم يعملها كتبت له حسنة ، فان عملها كتبت له سيئة واحدة او يمحوها الله ، ولايهلك على الله تعالى الا هالك )**[٣] .

واتە: ( خوای تەبارەکەوتەعالا بەبەزەیی یە ، هەر کەس نیازی چاکە بکات و نەیکات ، ئەوا خێری بۆدەنووسرێت ، ئەگەر ئەو چاکەیە بکات ئەوا ، ئەوا (١٠) چەندان قات بۆی دەنوسرێت هەتا حەوت سەد چەندان ، وەهەر کەس نیازی خراپەیەک بکات و نەیکات ئەوا خێرێکی بۆدەنوسرێت ، وەئەگەر خراپەیەک بکات ئەوا یەک خراپەی بۆ دەنوسرێت یان خودا دەیسرێتەوە ) .

**وعن ابي ذر ( ﷺ ) قال : قال رسول الله ( ﷺ ) : ( يقول الله عزوجل : من عمل حسنة فله عشر امثالها وازيد ، سومن عمل سيئة ، فجزائه سيئة مثلها او اغفر ، ومن اقترب الي شبرا اقتربت اليه ذراعا ، ومن اقترب الي ذراعا اقتربت اليه باعا ، ومن اتاني يمشي اتيته هرولة ) .**

واتە: ( خودا فەرموویەتی : ( هەرکەس چاکەیەک بکات ئەوا دەچەندان وێنەی بۆدەنوسرێت وەبۆی زیاتر دەکەم ، وەهەر کەس خراپەیەک بکات ئەوا یەک خراپەی بۆ دەنوسرێت ، یان لێی خۆش دەبم ، وەهەر کەس بستێ لە من نزیک بێتەوە من باڵێک لێی نزیک دەبمەوە ، وەهەر کەس باڵێک لێم نزیک بێتەوە ئەوا من باعێک لێی نزیک دەبمەوە ، وەهەرکەس بەڕۆیشتن بەرەو ڕووم بێت من بەهەروەلە بەرەورووی دەڕۆم ) .

**وعن ابي هريرة ( ﷺ ) ، عن النبي ( ﷺ ) : ان رجلا اذنب ذنبا فقال : اي رب ! اذنبت ذنبا فاغفرلي ، فقال تبارك وتعالى : علم عبدي ان له ربا يغفر الذنب ويأخذ به ، قد غفرت لعبدي ، ثم مكث ماشاء الله ، ثم اذنب ذنبا آخر فقال : اي رب ! عملت ذنبا فاغفرلي ، فقال عزوجل علم عبدي ان له ربا يغفر الذنب ويأخذ به ، قد غفرت لعبدي . ثم مكث ماشاء الله ، ثم اذنب ذنبا آخر فقال : اي رب ! عملت ذنبا فاغفره لي ، فقال : علم عبدي ان له ربا يغفر ذنبا ، اشهدكم اني قد غفرت لعبدي ، فاليعمل ماشاء ) ( ٥ ) ، هذه الاحاديث كلها صحاح .**

**من حديث عمر ابن الخطاب (ﷺ) قال : ( قدم على رسول الله (ﷺ) بسبي ، واذا امراءة من السبي تسعى ، اذ وجدت صبيا في السبي فاخذته ، فالصقته ببطنها ، فارضعته ، فقال رسول الله (ﷺ) : ( اترون هذا المراءة طارحة ولدها في النار؟ ) قلنا : لاوالله ، قال: ( الله ارحم بعباده من هذه المراءة بولدها )** [٨٨]

**من حديث ابي ذر (ﷺ) ، عن النبي (ﷺ) انه قال : ( مامن عبد قال : لااله الاالله ، ثم مات على ذلك الا دخل الجنة ) . قلت : وان زنى وان سرق ؟ قال : ( وان زنى وان سرق؟ وان زنى وان سرق؟ وان زنى وان سرق ) ثم قال في الرابعة : ( على رغم انف ابي ذر )** [٨٩]

واتە : ( هیچ بەندەیەک نییە بلێ ( لااله الاالله ) پاشان لەسەری مردووە ، ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە ) ئەبو زەر فەرمووی : ئەگەر ئەو بەندەیە داوێن پیسیو دزی کردبێت ؟ فەرمووی : باداوێن پیسیو دزی بکات ، باداوێن پیسیو دزی بکات ، باداوێن پیسیو دزی بکات ، لەچوارەم جاردا فەرمووی :

**وفيهما من حديث عتبان بن مالك (ﷺ) ، عن النبي (ﷺ) انه قال: ( ان الله حرم النار على من قال: لااله الاالله ، يبتغي بذلك وجه الله ) .**

واتە : خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر ئاگر کەسێک بلێت: ( لااله الاالله ) وەمەبەستی رەزامەندی خودا بێت ) .

**وفيهما من حديث انس بن مالك (ﷺ) ، عن النبي (ﷺ) : انه قال : ( يخرج من النار من قال : ( لااله الاالله ، وكان في قلبه من الخير ما يزن شعيرة ، ثم يخرج من النار من قال : لااله الاالله وكان في قلبه من الخير وزن برة ، ثم يخرج من النار من قال : لااله الاالله وكان في قلبه من الخير مايزن ذرة ) .**

واتەئاگر دەردەچێ هەر کەسێ بلێ : ( لااله الاالله ) ، لەدڵیدا کێشی دەنکە جۆیەک خێری تیابێت پاشان لەدۆزەخ دەردەهێنرێت هەرکەس کێشی دەنکە گەنمێک خێری لەدڵیدا بێت ، پاشان لەدۆزەخ دەردەهێنرێت هەرکەس کێشی گەردیلەیەک خێر لەدڵیدا بێت ) .

---

(٨٨) رقي (الصحيحين)

(٨٩) رقي (الصحيحين)

**وعن أبی موسی (ﷺ) قال : قال رسول لله (ﷺ) :(إذا كان يوم القيامة لم يبق مؤمن إلا أتی بيهودی أو نصرانی حتی يدفع إليه فيقال له : هذا فكاك من النار) .**

واتە : ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (كاتێ ڕۆژی دوایی دێت ، هیچ بڕواداریێک نامێنێت ئیللا جولەكەیەك یان مەسیحیەك -دیانێک-ی بۆ دەهێنرێت و پێی دەوترێت ئەمە ڕزگاركەرتە لەئاگر) .

**وعن عبدالله بن عمرو بن العاص قال: قال رسول الله (ﷺ) (ان الله عزوجل يستخلص رجلا منامتي على رؤوس الخلائق يوم لقيامة ، فينشر عليه تسعة وتسعين سجلا ، كل سجل منها مد البصر ، ثم يقول اتنكر من هذا شيئا ، أظلمك كتبتي الحافظون ، قال : لايارب ، فيقول : الك عذر او حسنة ؟ فيبهت الرجل ن فيقول : لايارب فيقول : بلى ، ان لك عندنا حسنة واحدة لاظلم عليك اليوم ، فيخرج له بطاقة فيها :اشهد ان لااله الاالله وان محمدا عبده ورسوله ، فيقول : احضروه ، فيقول : ماهذه البطاقة مع هذه السجلات ، فيقال: انك لاتظلم ، فتوضع السجلات في كفة ، والبطاقة في كفة ، قال : فطاشت السجلات وثقلت البطاقة ، ولايثقل شىء مع اسم الله عزوجل) .**

واتە : خوای گەورە پیاوێک لەئوممەتەكەم ڕزگار دەكات لەسەرو هەموو بەشەریەت لەقیامەت دا ، وەنەوەت و نۆ سجیلی بۆ دەكرێتەوە ، هەر سجیلێک ئەوەندەی چاوی بڕبكات ، پاشان دەڵێت : ئایا دەتوانی بەرپەرچی هیچ یەكێک لەم تاوانانە بكەیت ، ئایا نوسەرانم -فریشتەكان- ستەمیان لێكردوویت ، ووتی نەخێر ئەی پەروەردگار وەفەرمووی : ئایا هیچ بەهانەیەك یان خێرێكت هەیە ، پیاوەكە سەرسام دەبێت ووددەڵێت : نەخێر ئەی پەروەردگار ، وەخودا دەفەرموێت: بەڵێ -تۆ تەنها یەك خێرت هەیەو ئەمڕۆ ستەمت لێناكرێت بلیتێكی بۆ دەردەهێنرێت كەتیایدا : **اشهد ان لااله الاالله وان محمدا عبده ورسوله )**

خودا دەفەرموێت : (ئامادەی بكەن دەڵێن : ئەم بلیت و سجلانە چیە ؟ ، دەوترێت : ستەمت لێناكرێ ، سجیلەكان دەخرێنە تایەكیەوەو بلیتەكەش دەخرێتە تایەكەی ترەوە ، فەرمووی : سجیلەكان سووك دەبن و بلیتەكە قورس دەبێت ، وەهیچ شتێک ئەندازەی ناوی خودا قورس نابێت .

**ونظر الفضيل بن عياض الى تسبيح الناس وبكائهم يوم عرفة فقال : ارايتم لو ان هؤلاء صاروا الى رجل يسألونه دانقا ، اكان يردهم ، فقيل: لا ، فقال : والله المغفرة عند الله عزوجل اهون من اجابة رجل بدانق !**

واته : فوزەیلی کوڕی عیاز سەیری کرد لەرۆژی عەرەفاتدا خەڵکی دەگریاو تەسبیحاتیان دەکرد ئنجا فەرمووی : ئایا ئەگەر ئەم خەڵکانە دەرۆیشتنە لای پیاوێک داوای شەش یەکی درهەم یان کرد ، ئایا نائومێدیان دەکات و نایانداتێ ووترا : نەخێر ، ئنجا فەرمووی : سوێند بەخودا بەزەیی خودای گەورە ئاسان ترە لەشەش یەکی درهەم پێدانی ئەو پیاوە !

**وعن ابراهيم ابن ادهم قال: خلا لي الطواف في ليلة شديدة المطر ، فلم ازل اطوف الى السحر ، ثم رفعت يدي الى السماء ، فقلت اللهم اني اسألك ان تعصمني عن جميع ماتكره ، فاذا قائل يقول في الهواء : انت تسألني العصمة ، وكل خلقي يسألني العصمة ، فاذا عصمتك فعلى من اتفضل ؟**

واتە : ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم فەرمووی شەوێکی لێزمە باران تەواف کرد ، و هەتا پارشێو تەوافم کرد ، پاشان دەستم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان ، ووتم : خوایە بمپارێزە لەهەموو ئەوانەی پێت ناخۆشە ، یەکێ لەئاسمان ووتی : تۆ داوای ئەوەم لێ دەکەی کەبێ تاوان بیت ، خەڵکی هەمووی داوای ئەوە دەکەن تاوان کەن و لەتاوان بیانپارێزم ئنجا گەر تۆ لەتاوان بپارێزم ئەی فەزڵ بەسەر کێدا بکەم !!

و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

و صلى الله على حبيبنا محمد و على آله و صحبه و سلم

**تێبینی :**

هەر فەرموودەیەک یان ووتەی زانایەک ئاماژە نەکرابوو بۆ ڕاویەکەی تکایە بگەڕێرەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی کە ئاماژەیان بۆ دەکەم –إن شاء الله– بە تایبەتی کتێبەکەی –د. عمر سليمان الأشقر–الجنة و النار–
بەڵام هەموو توانا خراوەتە گەڕ کە تەنها فەرموودەی –صحيح– ، یان –حسن– بهێنرێت ، بە هیچ جۆرێک پشت بە فەرموودەی –ضعيف– نەبەستراوە ، ئەمەش ئاگادارییەکە بۆ ئەو قوتابییانەی هەوڵ دەدەن هەموو زانیارییەکیان لەسەر بنەما و بنچینەیەکی زانستی پاک وەربگرن ، دوور لە هەموو ئەفسانە و حەکایەت خوانییەک .

زانای موفەسیر ابوبكر جابر الجزائری ﷺ لەتەفسیری ئەم سورەتەدا فەرموویەتی
بەڕاستی ئەبولەهەب زەرەری كرد ، وەهەموو شتێكی دۆڕاند ، ئەم ڕستەیەش ڕستەی نزا كردنە لە ئەبولەهەب بۆیە ئەوەندەی نەبرد بە نەخۆشی‌یەكی كوشندەی سامناك لەناوچوو وە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مایەوە ، لاشەكەی بۆگەنی كرد ، وەمناڵەكانی بەسابون و ئاو بەجوانی شۆردیان ، پاشان خوای گەورە باس لەوە دەكات كەهیچ لەماڵ و سامانی سودی پێ نەكەیاند وەئەو سزایەی دۆزەخی لەسەر لانەبردو لەدۆزاخ ڕزگاری نەكرد ، بەڵكو دەچێتە ئاگرێكی بڵێسەداری كڵپەسێنەر .
هەروەها خێزانەكەیشی كەناوی ( ام جمیل ) بوو ، ئەم ئافرەتە پیشەی قسە هاتوچۆ پێكردن و دوو زمانی كردن بوو ، وەدڕكی تیژی لەسەرە ڕێگای پێغەمبەر ﷺ دادەنا كاتێك دەر دەچوو بۆ نوێژی بەیانی ، وەلەملی خێزانەكەیدا گوریسێك هەیە لە پەلكی خورما (أیسر التفاسیر ج ٥ ص ٦٢٧)
قتادة ﷺ فەرموویەتی : لەملیدایە مورووی سپی كە لەدەریا دەهێنرێت ، هەندێ دەڵێن : واتە ئەو ئافرەتە ئەوەندە خراپ بووە بەستراوە لەوەی كە بڕوا بهێنێت ( **جامع الاحكام القرآن ج١٠ ص٢٤٢** )
لاپەڕە (٨٠) ئەبوو هورەیرە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : پیاوێك تاوانێكی كرد ، ووتی : ئەی پەروەردگار تاوانێكم كرد لێم خۆش ببە ، خوای گەورە فەرمووی : بەندەكەم زانی كە پەروەردگارێكی هەیە و تۆڵەی لێ دەستێنێت بۆیە داوای لێ دەكات ، لەبەندەكەم خۆش بووم .
پاشان دەمێنێتەوە هێندەی ئارەزوو بكات ، پاشان تاوانێكی تر دەكات ، وە دەڵێت : ئەی پەروەردگار تاوانێكم كرد لێم خۆش ببە ، خوای گەورە فەرمووی : بەندەكەم زانی پەروەردگارێكی هەیە ، لەبەندەكەم خۆش بووم . پاشان ماوەیەكی تری پێ چوو گوناهێكی تری كردو وتی : ئەی پەروەردگار :تاوانێكم كرد لێم خۆش ببە ، دەفەرمووێت : بەندەكەم زانی پەروەردگارێكی هەیە لە تاوان خۆش دەبێت ، ئێوە دەكرم بەشاهید كەمن لێی خۆش دەبم ، دەباچی دەكات بیكات )
لاپەڕە (٨١) عومەری كوڕی خەتاب ﷺ فەرموویەتی : كەنیزەكێكیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ یەكێ لە ئافرەتە كەنیزەكەكان بە هەڵە داوان دەڕۆیشت ، لە ناو ئافرەت و دەستكەوتەكانی جەنگدا ، منداڵێكێ بینی وكرتیە ئامێز ، بە خۆیەوە لچكاند ، شیری دایە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئایا ئەو ئافرەتە دەبینن وە بڕوا دەكەن كە ئەو منداڵە فڕێ بداتە ئاگرەوە؟ ووتمان : بە خوا نەخێر ، فەرمووی : خوا بەڕەحم ترە بە بەندەكانی لەو ئافرەتە بۆ منداڵەكەی

# سەرچاوەکان


| سەرچاوە | نووسەر |
| --- | --- |
| - القرآن الكريم | |
| - تەفسیری قورئانی پیرۆز | ماموستا مەلا عوسمان عەبولعەزیز |
| - زبدة التفسير | محمد سليمان عبدالله الأشقر |
| - تفسير آيات الأحكام | للقرطبى |
| - تفسير القرآن العظيم | لحافظ إبن كثير |
| - الجنة و النار | د. عمر سليمان الأشقر |
| - عقيدة المؤمن | أبو بكر جابر الجزائرى |
| - تخويف من النار | لإبن رجب |
| - البحر الرائق في الزهد و الرقائق | أحمد فريد |
| - رياض الصالحين | لإمام النووى |
| - التذكرة | للقرطبى |
| - ترتيب الأحاديث صحيح الجامع الصغير | للشيخ الألبانى |
| - جهنم أهلها و أحوالها | |
| - أهوال القيامة | على الكليب |
| - كتاب الحدائق في علم الحديث و الزهديات | لإبن الجوزى |
| - الترغيب و الترهيب | للمنذرى |
| - سلسلة الأحاديث الصحيحة | للشيخ محمد ناصر الدين الألبانى |
| - سلسلة الأحاديث الصحيحة | شيخ محمد ناصر الدي الألبانى |
| - مختصر منهاج القاصدين | إبن قدامة المقدسي |
| - أيس التفاسير | ابو بكر جابر الجزائرى |
| - مختصر منهاج القاصدين | على بن حست على عبدالحميد و شعيب الأرناؤوط |

# پێرست